


# فۆرمات

## لەگەڵ دانانی سیستەمی ویندۆز






ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

١٤٢٥ هەولێر ٢٠٠٤

# فۆرمات

## لەگەڵ دانانی سیستەمی ویندۆز

ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

تەفسیر
١٤٢٥ هەولێر ٢٠٠٤

ناوی کتێب: فۆرمات
لەگەڵ دانانی سیستەمی ویندۆز

ئامادەکردنی: ئاراس حاجی مولود

کۆمپیوتەر: مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس

تایتڵی بەرگ: نەوزاد کۆیی

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر

ژمارەو ساڵی چاپ: چاپی یەکەم ١٤٢٥- ٢٠٠٤

چاپکردن: چاپخانەی

تیراژ: ٥٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٤٤٦) ساڵی ٢٠٠٤

تفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
تەلەفۆن: ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
مۆبایل: ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشکەش

- پێشکەشە بە هەموو زانست خوازێکی بواری کۆمپیوتەر .
- پێشکەشە بە هەموو کوردێکی پاك و بە شەرەف .
- پێشکەشە بەو کەسانەی کە هاندەرم بوون .
- پێشکەشە بە هەموو دۆست و برادەرانم .
- پێشکەشە بە دایك و باوکی زۆر لە دڵا شیرینم .

# بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

سەرەتا سوپاس و ستایشی خودای گەورە ئەکەم کە توانای پێ بەخشیوم بتوانم یارمەتی دەرێك بم بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم زانستەی، کە بە زانستی سەردەم ناسراوە. خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم کە ئەم جارەشیان توانیم بەرهەمێکی تر بخەمە بەر دەستی خوێنەرانی ئازیز.

بەرهەمی ئەم جارەمان بریتیە لە چەند بابەتێکی گرنگ و پێویست بۆ هەموو کەسێك، کە ئامێری کۆمپیوتەر بەکار ئەهێنێ.

خوێنەری بەڕێزم: لەم کتێبەدا باسی چۆنێتی فۆرمات کردن و دانانی سیستەمی ویندۆز و دانانی بەشەکانی ئۆفیس و پێناسەکانی ئامێرەکە و بەرنامەی کۆپی کردنی سیدی و بەرنامەی پاك کردنەوەی سیستەمی ویندۆز و دانانی فۆنتی کوردی و چەند بابەتێکی تر کراوە کە هەموو ئەم شتانە لە پێویستیەکانی ئامێری کۆمپیوتەرن. بەو هیوایەم کە ئەم کتێبە ببێتە مایەی فێربوونی ئێوەی بەڕێز و بە هیوایەشم، کە هەردەم لە نزا و پاڕانەوەکانتان لە بەرامبەر پەروەردگار بێ بەشم نەکەن .

تێبینی : ئەم کتێبە سیدیەکی لەگەڵدایە، ئەو پێویستیانەی تێدایە کە لە کتێبەکە باس کراون بۆ فۆرمات و دانانی ویندۆز و فۆنتی کوردی و چەند پێناسەیەکی دەنگ و شاشە و مۆدێم و بەرنامەی نیرۆ و بەرنامەی ویندۆز واشەر .

ئاراس حاجی سەرود

مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس

هەولێر ٢٢٣٢٧٢١

# پێرست

## کورتە باسێك دەربارەی دیسکی (( Startup Disk )) Boot

خوێنەرانی ئازیز! سەرەتا پێم باشە کە باسێکی دیسکی Startup Disk بکەم، تا ئێوەی بەڕێز بتوانن بەکاری بێنن و سوودی لێ وەربگرن.

ئەم جۆرە دیسکە بۆ چوونە سەر سیستەمی (دۆس) بەکاردێ، تا بە هۆی ئەم دیسکەوە بتوانن لە ناو سیستەمی (دۆس) بەشە هاردەکان فۆرمات بکەن. هەروەها ناوەڕۆکی سیدی(CD)یەکەتان، یان فلۆپیەکە (3.5 Floppy) ببینن و، دوای کاری فۆرمات کردن هەر لە ناو سیستەمی دۆسدا بتوانن سیستەمی ویندۆز دابنێن.

ئازیزان! ئەگەر بتانەوێت بچنە سەر سیستەمی (دۆس) و کاری فۆرمات یان (F Disk) یان دانانی سیستەمی ویندۆز، یان گواستنەوەی فایل لە بەشە هاردێکەوە بۆ بەشە هاردێکی تر لە ناو سیستەمی دۆسدا بکەن؛ بێگومان دەبێ دیسکی (Startup Disk)تان هەبێت، یان سیدی (Boot)تان هەبێت. بەبێ ئەو دوو هۆکارە ناتوانن بچنە سەر سیستەمی (دۆس)، بۆیە ئامۆژگاریمان بۆتان ئەوەیە، کە هەموو کاتێك دیسکێکی (Startup Disk) یان سیدیەکی (Boot) با وەکو یەدەك لاتان هەبێت، بۆ ئەوەی هەر کاتێك کە پێویست بوو بتوانن ئەو کارە گرنگانەی، کە دەتانەوێ ئەنجامی بدەن لە ناو سیستەمی (دۆس)دا؛ ئەوە بە بێ گرفت ئەنجامی بدەن .






## چۆنێتی دروست کردنی دێسکی (( Startup Disk )) Boot

١- بۆ دروست کردنی دێسکی (Startup Disk) ئەبێت دێسکێکی بەتاڵ ئامادە بکەیت و، دڵنیا بیت لەوەی ئەو دێسکە هیچ گرفتی نیە. هەروەها ئەبێت دڵنیا بیت لەوەی، کە ئەو سیستەمەی (Startup Disk)کەی لێ دروست دەکەیت سیستەمێکی تەواو بێت. واتا ئەگەر سیستەمی ئەو ئامێرەی خۆت تەواو نەبوو، ئەوە ئەبێت لەسەر ئامێریکی تر دروستی بکەیت، کە سیستەمەکەی تەواو بێت (Startup Disk).

دوای دانانی دێسکە بەتاڵەکە بچۆرە سەر لیستی (Start)، لەوێشەوە بچۆرە سەر هەڵبژاردەی (Setting)، ئنجا لەوێ کلیك بکە لەسەر (Control Panel) تا بەشەکانی (Control Panel)ت بۆ دەرئەکەوێت، ئنجا بچۆرە سەر (Add / Remove Programs) و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ بکە، دەبینیت شێوەیەکت بۆ دەرئەکەوێت. لەو شێوەیەدا بچۆرە سەر بەشی (Startup Disk) و لەوێ کلیك بکە، دەبینی شێوەکە دەگۆڕێ و ئەبێت بە شێوەیەکی تر، کە لە وێنەکەی ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە، ئنجا دێسکەکە بخەرە ناو شوێنی تایبەتی خۆی لە ناو کەیسەکەدا، ئنجا کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Create Disk) و چاوەڕوان بە، تا بۆشاییەکەت بۆ پڕ ئەبێتەوە تا کۆتایی، واتا ١٠٠ ٪



٢- دوای دروست بوونی دیسکی (Startup Disk) ئەچینە سەر ئایکونەی (My Computer)، لەوێشەوە ئەچینە سەر (3.5 Floppy) بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەوەی کە (Startup) دروست بووە. ئنجا دەست دەکەیت بە گواستنەوەی ئەو فایل و بەشە گرنگانەی، کە خۆت لە ناو بەشە هاردی (C:/) یان (My Documents) پاراستوتە، بۆ ناو بەشە هاردی (D:/ ) یان (E:/) یان هەر بەشە هاردێکی تر، جگە لە بەشە هاردی (C:/)، چونکە کاتێك کە کرداری فۆرمات بۆ بەشە هاردێك دەکەیت، ئەو بەشە هاردە هیچی تێدا نامێنی. بۆیە وا باشە بە بەردەوامی فایل و بەشە گرنگەکانت لە بەشە هاردەکانی تردا بپارێزی، نەك لە بەشە هاردی (C:/) یان (My Documents) چونکە (My Documents) بەشێکە لە سیستەمی ویندۆز لە ناو بەشە هاردی (C:/).

<u>تێبینی</u> : ئەم کتێبە دیسکی (Startup Disk) و سیدی (Boot) و ئەو بەرنامانەی تێدایە، کە لەم کتێبەدا باس دەکرێن. هەروەها ئەو پێویستیانەی کە بۆ فۆرمات پێویستن لە ناو سیدیەکەدا هەیە .



## پێویستیەکانی ئەنجامدانی فۆرمات و دوای فۆرمات

٣- دوای گواستنەوەی فایلە پێویستەکان بۆ ناو بەشە هاردێکی تر، ئەگەر ویستمان کاری فۆرمات بکەین، ئەبێ ئەم پێویستیانەمان هەبێت :

١- سیدی ( Boot) یان دێسکی (Startup).

٢- سیستەمی ویندۆز ( Windows).

٣- پێناسەی دەنگ (Sound Card).

٤- پێناسەی شاشە (Display Card).

٥- پێناسەی فاکس مۆدیم ئەگەر هەبوو ( Fax Modem).

٦- پێناسەی لاین (Line Card) ئەگەر هەبوو.

٧- پێناسەی (یو اس بی Usb Port).

٨- ئۆفیس (Office).

ئەم بەشانە هەمووی پێویستە هەبێت لە کاتی فۆرمات کردن. لەو سیدیەی کە لەگەڵ کتێبەکەدایە، ئێمە زۆربەی ئەو بەشانەمان داناوە وەکو (Boot) و (Windows) و (Office) و هەندێ پێناسەی دەنگ و هەندێ پێناسەی شاشە و هەندێ بەرنامەی تر، کە لە بەشەکانی تر باسی ئەکەین.

<u>تێبینی</u> : لە کاتی کرینی هەر ئامێرێکی کۆمپیوتەر لە هەر نووسینگەیەک، یان مەڵبەندێك، یان کۆمپانیایەك، پێویستە ئەو شوێنە سیدیەکی تایبەتت پێ بدات، کە خۆی لەگەڵ ئەو ئامێرەدایە و هەموو پێناسەکانی ئەو ئامێرەی تێدایە کە تۆ دەیکڕیت. وەکو پێناسەی دەنگ (Sound Card) و شاشە (Display Card) و فاکس مۆدیم (Fax Modem) و لاین کارت (LineCard) و (یۆ اس بی Usb Port).

## ئه نجام دانی کرداری فۆرمات

٤- دوای ئەوەی هەموو ئەو پێویستیانەت ئامادە کرد، ئێستا دەتوانی خۆت بۆ فۆرمات کردن ئامادە بکەیت.

سەرەتا ئەو سیدی و ئەو دیسکە لە ناو شوێنی تایبەتی خۆی لە کەیسەکەدا دابنێ، ئنجا ئامێرەکە (Restart) بکەوە ئەگەر لە ناو کارکردندا بوویت. ئەگەریش ئامێرەکەت کوژابووە ئەوە ئامێرەکە بخە کار و ڕاستەوخۆ سیدی و دیسکەکە لە شوێنی خۆیان دابنێ. ئنجا لەسەر کەیسەکە دوگمەی (Restart) دابگرە، با ئامێرەکە لە سەرەتاوە دەسبەکار بێ، ئنجا ئەگەر فەرمانی (Boot) لە ناو (بایوس) لەسەر دیسك بوو، ئەوە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر (Boot) لە ناو (Ms-Dos)، ئەگەریش لەسەر سیدی بوو، ئەوە هەر ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر (Boot) لە ناو (Ms-Dos)، چونکە ئێوە هەردووکیانتان لە شوێنی خۆیان داناوە. واتا لە یەك کاتدا هەردوو سیدی و دیسکەکە لە شوێنی خۆیاندان، بۆیە هەر ئەبێ بچێتە سەر (Boot). ئەگەر (Boot) لە ناو (بایوس) لەسەر سیدی دابوو، ئەوە دەتوانن تەنها سیدیەکە دابنێن، ئەگەر لەسەر دیسك دابوو ئەوە تەنها دیسکەکە دابنێن. ئەگەر نەتانزانی (Boot) لەسەر کامیان بوو ئەوە هەردووکیان دانێن، دوای کەمێك لە (Restart) کردنەوەکە دەبینی لە ناو (Ms-Dos) چەند فەرمانێکت بۆ دەرئەکەوێت بەم شێوەیە :

```
Microsoft windows millennium startup menu
=========================================
1. Help
2. Start Computer With CD _ Rom Support .
3. Start Computer Without CD_ Rom Support .
4. Minimal Boot .

Enter a Choice :
```



ئنجا ئەبیٚ بچنە سەر ئەو فەرمانەی، کە لەسەرەوە ئامازەی بۆ کراوە. لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە و چاوەڕوان بکە، تا فەرمانەکان دەچێتە سەر ئەم شێوەیەی، کە لە ژێرەوە ئامازەمان بۆی کردووە .

```
Your CD _ Rom is Drive F
To View Help . Type Help And Then Press Enter .
A : \ >
```

٥- ئنجا دەست بە فۆرمات ئەکەین، کە فۆرمات کردن دوو شێوەی هەیە: شێوەی فۆرماتی هێدی و شێوەی فۆرماتی خێرا، کە هەردووکیان یەک ئامانج دەگەیێنن . فۆرماتی هێدی بەم شێوەیە ئەبێت :

لەدوای (A:\>) فەرمانی (format c:) دەنووسین.

```
Your CD _ Rom is Drive F
To View Help . Type Help And Then Press Enter .
A : \ > format c:
```

دوای نووسـینی (format c:) لەسـەر کیبۆردەکـە کلیلـی (Enter) دابگـرە . دوای ئەوەی کلیلی (Enter) لەسـەر کیبۆردەکە دادەگری ئـەم شێوەیەت بۆ دەرئەکەوێت :

```
A : \ > format c:
Warning . All Data On Non Removable Disk
Drive C: Will Be Lost !
Proceed  With Format ( Y / N ) ?
```

ئەمەش بۆ دڵنیا بوونـە لەوەی، کـە ئـەو بەشـە هـاردە هیـچ فـایلاتێکی تێدا نامێنێ. ئنجا ئەگـەر فـایلاتی گرنگـی تێـدا نـەبوو و، ئەگـەر ویسـتت بـەردەوام بیـت لـە فۆرمـات کـردن، ئـەوە لـە کۆتـایی دێڕەکـە پیـتی ( Y) بنووسە، بەم شێوەیەی کە لە ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە :

```
A : \ > format c:
Warning . All Data On Non Removable Disk
Drive C: Will Be Lost !
Proceed  With Format ( Y / N ) ? y
```

دوای نووسـینی پیـتی (Y) لـە کۆتـایی دێڕەکـەدا، لەسـەر کیبۆردەکـە کلیلـی (Enter) دابگـرە، دەبیـنی کـاری فۆرمـات کـردن بـۆ بەشـە هـاردی (C:) بە شێوەیەکی هێدی بەردەوام ئەبێت. چاوەڕوان دەبیـت، تـا ئـەبێت بە (١٠٠٪)، ئنجا کـاری فۆرمـاتی بەشـە هـاردی (C:) تـەواو ئـەبێت. واتـا ئەو بەشە هاردە سەرەکیە خاوێن ئەبێت و هیچ فایلاتێکی تێدا نامێنێ .

فۆرماتی خێراش بەم شێوەیە ئەبێت، واتا بە شێوەیەکی خێرا ئەو کردارە ئەنجام دەدرێت :

لەدوای (A:\>) فەرمانی (format c:/q) بنووسە و لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە ، دەبینین ئەم شێوەیەت بۆ دەرئەکەوێت :

```
A : \ > format c:/q
Warning . All Data On Non Removable Disk
Drive C: Will Be Lost !
Proceed  With Format ( Y / N ) ?
```

ئەمەش بۆ دڵنیا بوونە لەوەی، کە ئەو بەشە هاردە هیچ فایلاتێکی تێدا نامێنی. ئنجا ئەگەر فایلاتی گرنگی تێدا نەبوو و ویستت بەردەوام بیت لە فۆرمات کردن، ئەوە پیتی (Y) لە کۆتایی دێرەکە بنووسە بەم شێوەیەی کە لە ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە :

```
A : \ > format c:/q
Warning . All Data On Non Removable Disk
Drive C: Will Be Lost !
Proceed  With Format ( Y / N ) ? y
```

دوای نووسینی پیتی (y ) لە کۆتایی دێڕەکەدا لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە، دەبینی کاری فۆرمات کردن بۆ بەشە هاردی (C:) بە شێوەیەکی خێرا بەردەوام ئەبێت. جا چاوەڕوان دەبیت تا ئەبێت بە (١٠٠ ٪) ئنجا کاری فۆرماتی بەشە هاردی (C:) تەواو ئەبێت. واتا ئەو بەشە هاردە سەرەکیە خاوێن ئەبێت و هێچ فایلاتێکی تێدا نامێنی

ئەگەر بتانەوێ لە دوا هەنگاوەکانی کارکردن بۆ فۆرمات کردن پاشگەز ببنەوە، ئەوە دەتوانن تەنها لە جیاتی نووسینی پیتی (Y) بۆ بەردەوام بوون، پیتی (N) بنووسن بۆ پاشگەز بوونەوە، وەك ئەوەی لە وێنەکەدا لە ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە :

```
A : \ > format c:/q
Warning . All Data On Non Removable Disk
Drive C: Will Be Lost !
Proceed With Format ( Y / N ) ? N
```

دوای ئەوەی پیتی (N) دەنووسن لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرن، دەبینن کە کرداری فۆرمات کردنەکە دەگەڕێتەوە سەر هەنگاوەکانی سەرەتایی. واتا پاشگەز دەبینەوە لە کرداری فۆرمات کردن. ئەو بەشە هاردەش وەکو خۆی دەمێنێتەوە و ئەو فایلاتانەی تێیدایە هەر لە شوێنی خۆیان دەمێنێنەوە .

# چۆنێتی دانانی ویندۆز Windows me

**٦- هەنگاوەکانی دانانی سیستەمی ویندۆز:**

دوای ئـەوەی کـرداری فۆرمـات کـردن ئـەبێت بـە (١٠٠٪ )، دەبینـین شـێوەیەکی ترمـان بـۆ دەرئەکـەوێت، لـەو شـێوەیەدا ئێـوە دەتوانـن سیستەمێکی تازە لە سەر ئامێرەکە دابنێن، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەم سیدیەی لەگەڵ ئەم پەرتوکەدا هەیە و بەم شێوەیەی لای خوارەوە :

ئازیزان! پێش ئەوەی کرداری فۆرمات ئەنجام بدەیت، ئەبێت بزانی ئەو بەشەی سیدیەکەت بۆ دەخوێنێتەوە کام بەشە. واتا (E) یان (F) یان (G) یان (H) یان (I). ئەوە هەر لە سەرەتاوە سیستەمی (Ms Dos) ئەوەت بۆ دیاری ئەکات، وەك لە وێنەکەدا دیارە. واتا کاتێ کە ئەمە دەبینی ( Your CD _ Rom is Drive F)، ئـەوە هێمـای ئەوەیە ئەم بەشەی کە ئەو دیاری کردوە ئەگەر (E) یان (F) یان (G) یان (H) یان (I) بوو، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو بەشەیە سیدیەکەت بۆ دەخوێنێتەوە. بۆ نمونە لەم ئامێرەدا ئەو بەشەی، کە سیدیەکەمان بۆ دەخوێنێتەوە بەشی (F)ە. ئنجا لەبەر ئەوە ئێمە هەنگاوەکان بەو ڕێڕەوە ئەنجام دەدەین، بەڵام ئێوە ئەبێت لـە ئامێرەکـەی خۆتـان بڕواننـە ئـەو بەشـەی کـە سـیدیەکەتان بـۆ دەخوێنێتـەوە. واتـا بزانـن کـام بەشـە سیدیەکەتان بۆ دەخوێنێتەوە .

```
Your CD _ Rom is Drive F
To View Help . Type Help And Then Press Enter .
A :\ > format c:
```



<u>تێبینی</u> : ئەو ئامـاژە بۆ کـراوەی سـەرەوە پێمـان دەڵێ کە بەشـی F سیدیەکەمان بۆ دەخوێنێتەوە .

٧- لە کۆتایی ئەم نووسینە ( A : \ > ) کە لە ژێرەوە دیارە، دەبێت بنووسریٚ (F:) هەر بەم شێوەیە، ئنجا لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە، دەبینی شێوەی (A : \ >) ئەبێت بە (F: \ >)، دوای ئەوە ئەم وشانە بنووسە (cd winme)، ئنجا لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە، دەبینی (F: \ >) ئەبێت بە (F: \winme >). دوای ئەوە بنووسە (Setup)، ئنجا لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە، دەبینی شێوەیەکی ترت بۆ دێتە بەر چاو وەك ئەوەی کە لە وێنەکەی ژێرەوەدا دیارە :

```
A : \ > f:
F : \ > cd winme
F : \ winme >setup
Please wait while setup initializes .
Setup is now going to perform a rautine check on your system .
To continue, press ENTER . to quit setup , press ESC .
```

دوای ئەوەی ئەم شێوەیە دەبینی، لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرە .

کــه کلیلـــی (Enter) دادەگــری دەبیـــنی شــێوەیەکی تـــرت بـــۆ دەرئەکەوێت، کە شێوەی ســکان دێسـکە (Scandisk)، شاشــەکەت بـۆ ئەبێت بە ڕەنگی شین و کرداری سکان دێسـکت بۆ ئەنجام دەدات . واتا هەموو بەشە ھاردەکانت بۆ دەڕوانێت ، تا بزانێت هەڵەی هەیە یان نا ، ئنجا چاوەڕوان دەکەیت ، تا دەگاتە سەر ئەم ئاستـەی کـە لـە وێنـەی ژێرەوەدا دیارە :


Microsoft Scandisk

Scandisk Checked The Following Drives .

Drive C had no errors .

Drive D had no errors .

Drive E had no errors .

View Log < Exit >

کە گەیشتە سەر ئەم ئاستە، ئیوە دەتوانن بە هۆی ئاڕاستەکانی سـەر کیبۆردەکە ، واتا سەهمەکان بچنە سەر بەشی (Exit)، ئنجا لەسەر کیبۆردەکـە کلیلـی (Enter) دابگـرە ، تـا جـارێکی بگەڕێتـەوە بـۆ سـەر سیستەمی (Ms Dos). ئنجا کەمێك چاوەڕوان بکە، تا بەردەوام بێت لە دانانی سیستەمەکە ، ئنجا دوای کەمێك شێوەکەت بۆ دەگۆڕی و دەچێتە سەر هەنگاوەکانی دانانی سیستەمەکە .

سەرەتا شێوەی بۆشاییەکەت بۆ دەرئەکەوێت، چاوەڕوان بە تا بۆشاییەکەت بۆ پڕ ئەبێتەوە .

ئنجا دوای ئەوە شێوەیەکی ترت بۆ دەرئەکەوێت ، لەو شێوەیەدا بە هۆی کیبۆردەکەوە بە کلیلی (Tab) بچۆرە سەر (Next)، ئنجا بۆ بەردەوام بوون ، لەسەر کیبۆردەکە کلیك لەسەر (Enter) بکە.




دیسان شێوەیەکی ترت بۆ دەرئەکەوێت ، بۆ بەردەوام بوون بە هۆی کیبۆردەکەوە بە کلیلی (Tab) بچۆرە سەر (Next)، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Enter) .

ئازیزان ! ئەوەی شایانی باســە ئەوەیــە، کــە چــەند شـێوەیەکی لـەم چەشنەتان بۆ دەرئەکەوێت، ئێوەی بەڕێز دەتوانــن بـۆ بـەردەوام بـوون کلیلك بکەن لەسەر (Next) ، تا شێوەی ستار تـەپ (Start up)، لـەوێدا شێوەی بۆشاییەکتان بۆ دەرئەکەوێت، کە داوای دروست کردنی دێسکی (ستارت ئەپ)تان لێ ئەکات .

که بۆشاییەکه بوو به ٪ ٢٠ شێوەیەکی تر دەرئەکەوێت، کـه داوای دانانی دێسکێك له ناو (Floppy Drive) ئەکات . ئێوه نه پێویستیتان به دروست کردنی (ستارت ئەپ) هەیـه و نـه پێویستیتان بـه دانـانی دێسك هەیه . لەبەر ئەوەی ئێمه ئەم کارەمان هەر لـه سـەرەتاوه بـاس کردووه ، واتا ئێوه دێسکی (ستارت ئەپ)تان هەیه ، که ئەو دێسکه یان سیدیەکەی لـه پێشـدا ئامـاژەمان بـۆی کـرد ، تەنـها بـۆ چوونـه سـەر سیستەمی (دۆس) بوو ، ئێوەش هەردووکیتان هەیه . ئنجا لەبەر ئەوه دەتوانن کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Cancel) تا بەردەوامی به دانانی ویندۆزەکه بدەن. دوای ئـەوه چاوەڕوان دەبین تا بۆشـاییەکه ئەبێت بـه (١٠٠ ٪)، ئەوسا کلیك لەسەر فەرمانی OK ئەکەین. ئنجا بو ماوەی (١٥) چرکه چاوەڕێ ئەکەین، دەبینین ئامێرەکه (Restart)ریستارت ئەبێتەوه. واتا دەکوژێتەوه و سەر له نوێ هەڵ ئەبێتەوه ، بەڵام لەگەڵ کوژانەوەکه ئەبێت سیدیەکه و دێسکەکه له ناو ئامێرەکه دەربێنن، تا بەردەوامی به دانانی سیستەمی ویندۆز بدەین.



دوای ئـەوەی ئامێرەکـە ئیش دەکاتـەوە، کـەمێك چاوەڕوان ئەکـەین دەبینین جوڵەیەك هەیە ، واتا هەر خۆی بەردەوامە لە دانانی سیستەمە تازەکـە . دوای کـەمێك لـە چـاوەڕوانی دەبینـین شـێوەیەکمان بـۆ دەردەچێت، کە دوو بۆشایی تێدایە ، بۆشایی یەکەم شوێنی ناوە ، ئێوە دەتوانـن لـە نـاوی خۆتـان بنووسـن ، بۆشـایی دووەم شـوێنی نـاوی کۆمپانیایە ، ئێوە دەتوانن ناوی کۆمپانیەکەتان یان هـەر دەزگاییێکی تـر بنووسـن . دوای ئـەوە کلیك لەسـەر فەرمانی (Next) بکـەن ، دەبینـین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ، کە کۆمەڵێك بۆشایی بچووکی تێدایە، کە ئەم بۆشایانەش داوای ژمارەی نهێنی سیستەمە تازەکە ئەکات، ئێمـە ژمـارەی نـهێنیی ئـەو سیسـتەمەمان بـۆ ئێـوە ئامـادە کـردووە کـە لـە سیدی‌یەکەدایە، ئەویش بەم شێوەیە :

HMQ67-PGP38-QD6D8-CJXDY-YG3FY

دوای ئەوەی ئـەم ژمـارە نهێنیانـە لـە نـاو بۆشـاییەکاندا دەنووسـن ، کلیك بکەن لەسـەر فـەرمانی (Next)، دەبینـین بـەردەوام ئـەبێت لەسـەر دانـانی سیستەمەکە . ڕەنگە تا تـەواو بوونـی دانـانی سیسـتەمەکە دوو جار ئامێرەکە ریستارت بێتەوە، واتا بکوژێتەوە و ئیش بکاتـەوە ، بـەڵام هەر وەك لە پێشدا ئاماژەمان بۆی کردبوو ، ئەبێت سیدی یان دێسکەکە لە ناو ئامێرەکەدا دەربکەن .

بـەم شـێوەیە بـەردەوام دەبـین تـاکو هـەنگاوی کۆتـایی دانـانی سیسـتەمەکە دەبینـین . لـە کۆتـایی دانـانی سیسـتەمەکە بـۆ دوا جـار ئامێرەکە (ریستارت) ئەبێتەوە و سەر لە نوێ ئامێرەکە ئیش دەکاتەوە .

تێبینـی : دوای تـەواو بوونـی سیسـتەمەکە پێویسـتمان بـە پێناسـە کردنی بەشەکانی کارتی شاشە و کارتی دەنگ و کارتی مۆدێم ئـەبێت ، تا ڕەنگ و دەنگ و بەستنەوەی بە تۆڕی ئینتەرنێت بە شێوەیەکی تـەواو و دروست ئەنجام بدەین .

## چۆنێتی پێناسه کردنی کارتی شاشه Display Card

خوێنــەری بــەڕێز ! دوای دانــانی سیســتەمی ویـنـدۆز لەســەر هــەر ئامێرێك، گرنگترین بەش کە پێویستی بە پێناسە کردن هەبێت بەشی کارتی شاشەیە. ئنجا هەندێك کات پێناسەی کارتی شاشەکە لە ڕێگای دانانی سیستەمەکەوە ئەبێت، ئەویش ئەگەر ئـەو جـۆرە پێناسـەیە لـە پێشتر لە ناو سیستەمەکەدا ئامادە کرابێت . واتا هەموو سیستەمێکی ویندۆز هەندێك لە پێناسەی شاشە و دەنگ و بەشە گرنگەکانی تری ناو ئامێری کۆمپیوتەر ئامادە ئەکات، تا بەکارهێنەرەکان ماندوو نـەبن لـە پێناسە کردنی کارتەکانی دەنگ و شاشە و...هتد.

ئەگـەر دوای دانـانی سیسـتەمی ویـنـدۆز کـارتی شاشـەکە پێناسـە (تعریف) نەبوو ، ئەوە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین :

بۆ پێناسـەکردنی کارتی شاشـە پێویسـتیمان بـە پێناسـەکە ئـەبێت لەسەر سیدی . واتا ئەبێت ئەو جۆرە سیدی‌یەمان هەبێت ، کە تایبەتە بە کارتی شاشە، ئەو سیدیە لە ناو بەشی تایبەت بە خوێندنەوەی سیدی دادەنێن، ئنجا دەتوانین بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای پێناسەکەدا بگەڕێین ، تا ئەو جۆرە کارتەمان بۆ پێناسە بکات بەم شێوەیە :



دوای دانانی سیدیەکە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) و کلیکی لای ڕاست لەسەر ئەو ئایکۆنەیە ئەکەین ، دەبینین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ . لەو لیستەدا ئەچینە سەر فەرمانی (Properties) و کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت، لەو شێوەیەدا ئەچینە سەر (Device manager) و کلیکی لەسەر ئەکەین، دەبینین بەشەکانی (Device manager) بۆمان دەرئەکەوێت . ئنجا ئەچینە سەر بەشی (Display Adapter) و دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ، لەو شێوەیە ئەچینە سەر بەشی Standard Pci Graphics Adapter ( vga ) و دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین . ئنجا ئەچینە سەر بەشی (Driver) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، ئنجا لە ژێرەوەی شێوەکە ئەچینە سەر بەشی (Update Driver...) و یەك کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین .



دوای کلیك کردن لەسەر ( Update Driver) ، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا دوو بازنەی بچووك دەبینین ، کە بازنەی سەرەوەی دیاری کراوە . ئەگەر بازنەی ژێرەوە دیاری کرابوو ئەوە بازنەکەی سەرەوە دیاری بکە و کلیك بکە لە سەر بازنەی سەرەوە بۆ دیاریکردنی . ئنجا دوای ئەوەش کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next) تا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای پێناسەی کارتی شاشەکەدا بگەڕێ ، تا بیدۆزێتەوە . ئەمە بە مەرجێك دڵنیا بیت لەوەی ئەو سیدیەی، کە لە ناو ئامێرەکەدا داتناوە پێناسەی کارتی شاشەی تێدا بێت ، ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا نەبێت ، ئەوە بۆت نادۆزێتەوە. واتا پێناسەی کارتی شاشەت بۆ ناکات ، بەڵام ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا هەبێت ، ئەوە پێناسەی شاشەکەت بۆ ئەکات.



دوای ئەوەی لەسەر گەڕانی ئۆتۆماتیکی کلیك دەکەیت، دوای چەند چرکەیەك دەبینی چەند بۆشاییەکت بۆ دەرئەکەوێت ، کە هەر بۆ خۆی پڕ ئەبێتەوە . لە دوای پڕ بوونەوەدا شێوەکە دەگۆڕی و تەواو ئەبێت لە دانانی پێناسەی کارتی شاشەدا ، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Finish)، ئنجا داوای (ریستارت) کردنەوەی ئامێرەکە ئەکات ، ئێوە لەسەرتانە تەنها کلیك بکەن لەسەر (Ok ) بۆ ئەوەی ئامێرەکە (ریستارت) ببێتەوە . کاتێك ئامێرەکە ئیش دەکاتەوە دەبینین ڕەنگی شاشەکە ئاسایی ئەبێتەوە . واتا دەبینین پێناسەی کارتی شاشەکە بە شێوەیەکی دروست ئەنجام درا.



## چۆنێتی پێناسه كردنی كارتی دەنگ Sound Card

ئازیزان ! دوای دانانی سیستەمی ویندۆز لەسەر هەر ئامێرێك و، دوای پێناسە كردنی كارتی شاشه ، بەشێكی تری گرنگ هەیە كە پێویستی بە پێناسه كردن هەیە ، ئەو بەشەش كارتی دەنگە . ئنجا هەندێك كات پێناسەی كارتی دەنگ لە رێگای دانانی سیستەمەكەوە ئەبێت ، ئەویش ئەگەر ئەو جۆرە پێناسەیە پێشتر لە ناو سیستەمەكەدا ئامادە كرابێت . واتا هەموو سیستەمێكی ویندۆز هەندێك لە پێناسەی دەنگ و شاشه و بەشە گرنگەكانی تری ناو ئامێری كۆمپیوتەر ئامادە ئەكات ، تا بەكارهێنەرەكان ماندوو نەبن لە پێناسە كردنی كارتەكانی دەنگ و شاشه و ...هتد.

ئەگەر دوای دانانی سیستەمی ویندۆز كارتی دەنگ پێناسه (تعريف) نەبوو، ئەوە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەكاربێنین :

بۆ پێناسە كردنی كارتی دەنگ پێویستیمان بە پێناسەكە ئەبێت لەسەر سیدی ، واتا ئەبێت ئەو جۆرە سیدیەمان هەبێت ، كە تایبەتە بە كارتی دەنگ ، ئەو سیدیە دادەنێنە ناو بەشی تایبەت بە خوێندنەوەی سیدی ، ئنجا دەتوانین بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی بە دوای پێناسەكەدا بگەرێین ، تا ئەو جۆرە كارتەمان بۆ پێناسە بكات ، هەر بە هەمان شێوەی پێناسە كردنی كارتی شاشه .



دوای دانانی سیدیەکە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) و کلیکی لای ڕاست لەسەر ئەو ئایکۆنەیە ئەکەین ، دەبینین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ ، لەو لیستەدا ئەچینە سەر فەرمانی (Properties) و کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت لەو شێوەیەدا ئەچینە سەر (Device manager) و کلیکی لەسەر ئەکەین ، دەبینین بەشەکانی (Device manager) بۆمان دەرئەکەوێت . ئنجا ئەچینە سەر بەشی (Other Devices) کە ئەمە شێوەکەیەتی ؟ ، ئنجا دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا بەشەکانی دەربکەوێت ، ئنجا ئەچینە سەر بەشی (PCI multimedia Sound card) و دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، ئنجا شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ . لەو شێوەیە ئەچینە سەر بەشی (Driver) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، ئنجا لە ژێرەوەی شێوەکە ئەچینە سەر بەشی (...Update Driver) و یەك کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین .



دوای کلیك کردن لەسەر ( Update Driver) دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ، لەو شێوەیەدا دوو بازنەی بچووك دەبینین، کە بازنەی سەرەوەی دیاری کراوە . ئەگەر بازنەی ژێرەوە دیاری کرابوو ، ئەوە بازنەکەی سەرەوە دیاری بکە و کلیك بکە لە سەر بازنەی سەرەوە بۆ دیاری کردنی ، دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next)، تا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای پێناسەی کارتی دەنگەکەدا بگەڕێ و بیدۆزێتەوە . ئەمە بە مەرجێك دڵنیا بیت لەوەی ئەو سیدیەی ، کە لە ناو ئامێرەکەدا داتناوە پێناسەی کارتی دەنگی تێدا بێت . ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا نەبێت ، ئەوە بۆت نادۆزێتەوە ، واتا پێناسەی کارتی دەنگت بۆ ناکات . بەڵام ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا هەبێت ، ئەوە پێناسەی دەنگەکەت بۆ ئەکات.



دوای ئەوەی کلیك دەکەیت لەسەر گەڕانی ئۆتۆماتیکی ، دوای چەند چرکەیەك دەبینی چەند بۆشاییەکت بۆ دەرئەکەوێت ، کە هەر بۆ خۆی پڕ ئەبێتەوە . لە دوای پڕ بوونەوەدا شێوەکە دەگۆڕی و تەواو ئەبێت لە دانانی پێناسەی کارتی دەنگ ، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Finish)، لە هەندێ کاتدا داوای (ریستارت) کردنەوەی ئامێرەکە ئەکات . واتا داوای کوژانەوە و ئیش کردنەوەی ئامێرەکە ئەکات ، ئێوە لەسەرتانە تەنها کلیك بکەن لەسەر (Ok) بۆ ئەوەی ئامێرەکە (ریستارت) ببێتەوە ، ئەگەر ئەو جۆرە فەرمانە دەرکەوت ، واتا ئەگەر داوای (ریستارت) کردنەوەی ئامێرەکەی کرد و کاتێك کە ئامێرەکە ئیش دەکاتەوە ، دەبینین دەنگێك لە ئامێرەکەوە دەردەچێت ، واتا دەبینین پێناسەی کارتی دەنگی بە شێوەیەکی دروست ئەنجام دا.



## چۆنێتی پێناسە کردنی فاکس مودێم Modem

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەبینین زانست بە شێوەیەکی بەرچاو گەشە ئەکات و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێش دەچێت ، ئەوەی من مەبەستمە تیشکی بخەمە سەر ئەوەیە ، کە تۆڕی ئینتەرنێت بەشێکە لەو زانستەی پێویستی بە باس کردن هەیە . ئنجا پێش ئەوەی باسی تۆڕی ئینتەرنێت بکەین ، پێویستە باسی پێناسە کردنی ئەو کارتە بکەین . ئەگەر کارتی (فاکس مۆدێم) لەسەر ئامێرەکەت هەبوو ، پێویستە ئەو کارتە پێناسە بکرێ . بەڵام ئەگەر ئەو جۆرە کارتە لەسەر ئامێرەکەت نەبەسترابوو ، ئەوە دەتوانن ئەو جۆرە کارتە بکڕن و لە سەر ئامێرەکەتان بیبەستن لە شوێنی تایبەتی خۆی لە سەر مەزەر بۆردەکە . دوای ئەوە پێویستە پێناسە بکرێت بۆ ئەوەی دوای پێناسە کردنەکە بتوانن تۆڕی ئینتەرنێت بەکاربێنن . ئەگەر ئەو جۆرە کارتەمان هەبوو ، ئەوا دەتوانین لە ڕێگای ئەو کارتەوە تۆڕی ئینتەرنێت بە کاربێنین.

ئازیزان ! دوای دانانی سیستەمی ویندۆز لەسەر هەر ئامێرێك و دوای پێناسە کردنی کارتی شاشە و دەنگ ، بەشێکی تری گرنگ هەیە ، کە پێویستی بە پێناسە کردن هەیە ، ئەو بەشەش (فاکس مۆدێم)ە .

خوێنەری ئازیز ! هەندێك كات پێناسەی (فاكس مۆدێم) لە ڕێگای دانانی سیستەمەکەوە ئەبێت . ئەویش ئەگەر ئەو جۆرە پێناسەیە لە پێشتر لە ناو سیستەمەکەدا ئامادە کرابێت ، واتا هەموو سیستەمێکی ویندۆز بەشێکی کەم لە پێناسەی دەنگ و شاشە و فاکس مۆدێمی ناو ئامێری کۆمپیوتەر ئامادە ئەکات ، تا بەکارهێنەرەکان ماندوو نەبن لە پێناسە کردنی کارتەکانی دەنگ و شاشە و فاکس مۆدێم ...هتد.

ئەگەر دوای دانانی سیستەمی ویندۆز (فاکس مۆدێم) پێناسە (تعريف) نەبوو ، ئەوە دەتوانین ئەم هەنگاوانە بەکاربێنین :

بۆ پێناسە کردنی (فاکس مۆدێم) پێویستیمان بە پێناسەکە ئەبێت لەسەر سیدی، واتا ئەبێت ئەو جۆرە سیدیەمان هەبێت ، کە تایبەتە بە فاکس مۆدێم ، ئنجا ئەو سیدیە دادەنێنە ناو بەشی تایبەت بە خوێندنەوەی سیدی . ئەوسا دەتوانین بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای پێناسەکەدا بگەڕێین ، تا ئەو جۆرە مۆدێمەمان بۆ پێناسە بکات ، هەر بە هەمان شێوەی پێناسە کردنی کارتی شاشە و کارتی دەنگ .



دوای دانانی سیدیەکە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) و کلیکی لای ڕاست لەسەر ئەو ئایکۆنەیە ئەکەین ، دەبینین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ . لەو لیستەدا ئەچینە سەر فەرمانی (Properties) و کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت . لەو شێوەیەدا ئەچینە سەر (Device manager) و کلیکی لەسەر ئەکەین ، دەبینین بەشەکانی (Device manager) بۆمان دەرئەکەوێت . ئنجا ئەچینە سەر بەشی (Other Devices) کە ئەمە شێوەکەیەتی ؟ ، ئنجا دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا بەشەکانی دەربکەوێت ، ئنجا ئەچینە سەر بەشی (PCI Modem) و دەبڵ کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین . ئنجا شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیە ئەچینە سەر بەشی (Driver) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین . ئنجا لە ژێرەوەی شێوەکە ئەچینە سەر بەشی (Update Driver...) و یەك کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین.



دوای کلیك کردن لەسەر ( Update Driver) دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ، لەو شێوەیەدا دوو بازنەی بچووك دەبینین ، کە بازنەی سەرەوەی دیاری کراوە . ئەگەر بازنەی ژێرەوە دیاری کرابوو ئەوە بازنەکەی سەرەوە دیاری بکە و ، کلیك بکە لە سەر بازنەی سەرەوە بۆ دیاری کردنی . ئنجا دوای ئەوەش کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next)، تا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای پێناسەی (فاکس مۆدێم)دا بگەڕێ و بیدۆزێتەوە . ئەمە بە مەرجێك کە دڵنیا بیت لەوەی ئەو سیدیەی ، کە لە ناو ئامێرەکەدا داتناوە پێناسەی (فاکس مۆدێم)ی تێدا بێت . ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا نەبێت ، ئەوە بۆت نادۆزێتەوە ، واتا پێناسەی (فاکس مۆدێم)ی بۆ ناکات . بەڵام ئەگەر پێناسەکە لە نێو سیدیەکەدا هەبێت ، ئەوە پێناسەی (فاکس مۆدێم)ت بۆ ئەکات.



دوای ئەوەی کلیك دەکەیت لەسەر گەڕانی ئۆتۆماتیکی ، دوای چەند چرکەیەك دەبینی کە چەند بۆشایییەکت بۆ دەرئەکەوێت ، کە هەر بۆ خۆی پڕ ئەبێتەوە . لە دوای پڕ بوونەوەدا شێوەکە دەگۆڕێ و تەواو ئەبێت لە دانانی پێناسەی (فاکس مۆدێم) ، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Finish)، ئنجا لە هەندێ کاتدا داوای (ریستارت) کردنەوەی ئامێرەکە ئەکات . ئێوە لەسەرتانە تەنها کلیك بکەن لەسەر (Ok) بۆ ئەوەی ئامێرەکە (ریستارت) ببێتەوە . ئەگەر ئەو جۆرە فەرمانە دەرکەوت ، واتا ئەگەر داوای ریستارت کردنەوەی ئامێرەکەی کرد ، کاتێك کە ئامێرەکە پێ ئەبێتەوە دەبینین، کە (فاکس مۆدێم)ەکە پێناسە بووە ، واتا پێناسەی (فاکس مۆدێم)ی بە شێوەیەکی دروست ئەنجام داوە.



## چۆنێتی پێناسە کردنی ئامێری چاپ کردن Printer

خوێنەری ئازیز ! دوای پێناسە کردنی ئەو بەشانەی کە زۆر پێویست بوون لە ناو ئامێرەکەدا ، ئەچینە سەر باسی ئەو پارچانەی کە دەکەونە دەرەوەی ئامێرەکە ، وەکو ئامێری چاپ کردن ( طابعة ) .

ئەگەر ئامێری چاپکردنتان هەبوو و ویستان کاری پێ بکەن ، ئەوە ئەبێت ئەو بەشەش وەکو بەشەکانی ناو کەیسەکە ، ئەبێت پێناسە بکرێت ، تا بتوانن نووسینەکانتان بەو ئامێرە چاپ بکەن .

ئنجا بەرێزەکانم بفەرموون بۆ باسی چۆنێتی پێناسە کردنی ئامێری چاپ کردن !

سەرەتا ئەم ئامێری چاپ کردنەش وەکو بەشەکانی پێشوو ، ئەبێت سیدیەکی تایبەتی لەگەڵدا بێت بۆ پێناسە کردن . ئەو سیدیە دادەنێنە ناو بەشی خوێندنەوەی سیدی ، دوای ئەوە ئەچینە سەر لیستی (Start)، ئنجا لەوێشەوە ئەچینە سەر بەشی (Settings).



لەوێشەوە ئەچینە سەر بەشی (Printers) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت . لەو شێوەیەدا ئەچینە سەر بەشی (Add Printer) ، ئنجا لەسەر ئەو بەشە دەبڵ کلیکی لای چەپ ئەکەین ، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ . بۆ بەردەوام بوون یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر (Next) ئەکەین، دوای ئەوە بۆ بەردەوام بوون دیسان کلیك ئەکەین لەسەر (Next) ، تا ئەم شێوەیەمان بۆ دەرئەکەوێت ، کە لە وێنەکەدا ئاماژەمان بۆی کردووە .



ئنجا ئەچینە سەر بەشی (Have Disk) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا ئەو کاتەی شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ . لەو شێوە تازەیەدا ئەچینە سەر بەشی (Browse) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت ، کە کۆمەڵێك بۆشایی و فەرمانی جۆراو جۆری تێدایە . ئێمە ئەچینە سەر بەشی (Drives) ، لەوێ کلیك ئەکەین و بەشی سیدی خوێندنەوە دیاری ئەکەین ، ئنجا لە بەشی (folders) لەسەرەوە ناوەڕۆکی سیدیەکە دەبینین . لە نێو ناوەڕۆکەکەدا لەسەر بەشی (Drive) دەبلْ کلیکی لای چەپ ئەکەین ، ئنجا ئەچینە سەر ناوی ئامێری چاپکردنەکە و دەبلْ کلیکی لەسەر دەکەین ، تا پێناسەکەی دەچێتە ئەو بەری بۆشاییەکەی تر . واتا (File Name) ، ئنجا پێناسەکە دیاری ئەکەین و کلیك ئەکەین لەسەر فەرمانی (Ok) .



ئنجا جارێكی تر كلیك لەسەر فەرمانی (Ok) ئەكەین ، دەبینین شێوەی بۆشاییەكمان بۆ دەرئەكەوێت ، كە خۆی پڕ ئەبێتەوە . ئێمە چاوەڕوان ئەكەین تا بۆشاییەكان بە تەواوی پڕ دەبنەوە ، ئنجا دوای ئەوە كلیك ئەكەین لەسەر فەرمانی (Next) . ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام دەبین ، تا دەگەینە سەر فەرمانی (Finish) ، ئنجا كلیك ئەكەین لەسەر (Finish) بۆ كۆتایی هێنان بە پێناسە كردنەكە ، دەبینین بەم شێوەیە ئامێری چاپكردنەكەمان پێناسە كرد.

ئەمە پێناسە كردن بوو لە ڕێگای (Add Printer) ، بەڵام هەندێك جار ئەم كارە بە شێوەیەكی ئاسانتر ئەنجام دەدرێت ، كە ئەویشیان لە ڕێگای سیدی (ئۆتۆ ڕەن)ەوە ئەنجام دەدرێت . واتا سیدیەكە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی دروست كراوە . كاتێ سیدیەكە دادەنێتە سەر بەشی خوێندنەوەی سیدی ، دەبینی شێوەیەكی (ئۆتۆ ڕەن) دێتە سەر ڕووبەری شاشە و كۆمەڵێك شتی تێدایە . ئەگەر بتەوێ لە ڕێگای ئەو (ئۆتۆ ڕەن)ەوە ئامێری چاپكردنەكە پێناسە بكەیت ، ئەبێت كلیك لە سەر (Install Printer) بكەیت و بەردەوام بێت لە هەنگاوەكانی پێناسە كردن، ئەویش لە ڕێگای كلیك كردن لەسەر فەرمانی (Next)



بەردەوام دەبین بە کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) ، تا دەگاتـە سەر تەواو بوونی پێناسە کردنەکە ، ئنجا بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە ئەو ئامێرە پێناسـە بـووە یـان نـەبووە ، ئـەوە دەتوانـی لـە ڕێگـای لیسـتی (Start) بچیتـە سـەر هـەڵبژاردەی (Settings) . ئنجا لەوێشـەوە بچیتـە سەر (Printer) و لەوێ کلیك بکە ، تا ببینی کە ئامێرەکە پێناسە بووە ، یان نەبووە . ئەگەر لە تەنیشت (Add Printer) شێوەی ئامێرێکی چاپ کردنت بینی ، ئەوە بە مانای ئەوە دێت ، کە ئەو ئامێری چاپ کردنەت پێناسە کردووە .

<u>تێبینی</u> : پێناسە کردنی ئامێری چاپ کردن لە جۆرێك بۆ جۆرێکی تر جیاوازی هەیە . واتا پێناسە کردنی هەموو ئامێرێکی چاپ کردن وەکو یەك نیە ، بەڵام لە ڕووی شێوەوە دەتوانین بڵێین ، کە شێوازی پێناسە کردن لە ڕێگای (Add Printer) بۆ هەموو ئامێرەکان ئەبێت .



# چۆنێتی دانانی بەشەکانی ئۆفیس Microsoft Office

دوای ئـەنجام دانـی کـاری فۆرمـات و دانـانی سیسـتەمی وینـدۆز و پێناسە کردنی هەموو بەشە گرنگەکان ، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر باسی دانانی بەشەکانی مایکرۆسۆفت ئۆفیس Microsoft Office کە ئەم بەشانەش لە چەند بەرنامەیەکی گرنگ پێك هاتووە :

١- بەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆرد Microsoft Word

٢- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئەکسڵ Microsoft Excel

٣- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئەکسس Microsoft Access

٤- بەرنامەی مایکرۆسۆفت پاوەر پۆینت Microsoft PowerPoint

٥- بەرنامەی مایکرۆسۆفت پێندر Microsoft Binder

٦- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئاوت لوك Microsoft Outlook



ئەگەر بمانەوێ ئەم بەشانە لەسەر ئامێرەکەمان دابنێین و لەسەر سیستەمەکە کاری لەسەر بکەین ، ئەوە ئەبێت سیدیەکمان هەبێت ئەم بەشانەی لەسەر بێت ، واتا (Microsoft Office) ئێمە ئەم بەشانەمان لە ناو ئەو سیدیە داناوە ، کە لەگەڵ ئەم کتێبەدایە . واتا بەشەکە بە ناوی (Microsoft Office 97) لە ناو سیدیەکەدا هەیە ، ئێوە دەتوانن سوودی لێ وەربگرن بۆ دانانی لەسەر سیستەمەکە . ئنجا بفەرموون بۆ باسی چۆنێتی دانانی (Microsoft Office 97) .

سەرەتا سیدیەکە دادەنێنە ناو بەشی خوێندنەوەی سیدی لە ناو کەیسەکە ، ئنجا دوای ئەوە ئەچینە سەر ڕووبەری شاشە و لەوێشەوە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) و ئەو ئایکونەیە ئەکەینەوە .



دوای کردنەوەی ئایکۆنەی (My computer) ئەچینە سەر بەشی خوێندنەوەی سیدی و ، ئەو بەشە بە دووجار کلیکی لای چەپ ئەکەینەوە ، تا ناوەڕۆکی سیدیەکە ببینین ، وەك دەبینین ناوەڕۆکی سیدیەکە زۆر فایلاتی تێدایە ، ئەوەی کە پێویست بێت بۆ دانانی بەشەکانی ئۆفیس ، واتا بەرنامەی (ۆرد) و (ئەکسل) و (ئەکسس) و (پاوەر پۆینت) ...هتد. فایلێکە بە ناوی (Office 97) ، ئنجا ئەچینە سەر فایلی (Office 97) و ئەو بەشە بە دوو جار کلیکی لای چەپ ئەکەینەوە .

**دوای کردنـەوەی فـایلی (Office 97) دیسـان کۆمـەڵێك فـایلی تــر دەبینین ، کە هەموو فایلەکان بە شێوەی ژمارە دانراون . ئنجا لە ناو ئەو فایلانەدا ئەچینە سەر فایلی (Disk 1) و بە دووجار کلیکی لای چەپ (Disk 1) ئەکەینەوە ، تا بـەردەوامی بـە دانـانی بەشـەکانی (ئۆفیـس) بدەین .**



**دوای کردنەوەی فایلی (Disk 1) ، دیســـان دەبینین چەنـد بەشـێکی تـر لـە نـاو ئـەو فایلـەدا هەیـە ، لـە نـاو ئـەو بەشـانەدا و بـۆ دانـانی (Microsoft Office 97) ئەچینە سەر بەشی (Setup) و دووجار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا دەست بەکار بین لە دانانەکە .**



**دوای ئەوەی دوو جار کلیکی لای چەپ لەسەر بەشی (Setup) ئەکەین ، ئەچینە سەر هەنگاوەکانی دانانی بەشەکانی (Microsoft Office 97) ، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت . لەو شێوەیەدا دوو فەرمان دەبینین ، کە دڵنیامان ئەکات لەوەی ئەگەر بمانەوێت بەردەوامی بدەین بە دانانی (Microsoft Office 97) ، ئەوە ئەچینە سەر فەرمانی (Continue) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین .**



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Continue) بۆ بەردەوام بوون لەسەر دانانی (Microsoft Office 97) ، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ ، کە دوو بۆشایی تێدایە ، بۆشایی سەرەوە ، واتا بۆشایی (Name) تایبەتە بە ناو ، دەتوانن هەر ناوێك بنووسن . بۆشایی دوومیش ، واتا بۆشایی (Organization)، تایبەتە بە ناوی دەزگا ، یان مەڵبەند ، یان کۆمپانیا ، واتا دەتوانن ناوی کۆمپانیایەك ، یان مەڵبەندێك ، یان دەزگایەك بنووسن . دوای پڕ کردنەوەی هەردوو بۆشایی ، یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Ok) ئەکەین .




<u>تێبینی</u> : لە پڕ کردنەوەی هەردوو بۆشاییەکەدا گرنگ نیە چ ناوێك بنووسیت ، بەڵام ئەبێت ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە . ئنجا دەتوانی لە بۆشایی یەکەم ناوی خۆت بنووسی ، یان ناوی هەر کەسێکی تر . لە بۆشایی دوومیشدا هەر بە هەمان شێوە دەتوانی ناوی ئەو دەزگایە ، یان ئەو کۆمپانیایە ، یان ئەو شوێنە بنووسی کە کاری تێدا دەکەیت .

دوای پڕ كردنەوەی هەردوو بۆشاییەكە و كلیك كردن لەسەر فەرمانی (Ok) شێوەیەكمان بۆ دەرئەكەوێت ، كە ئەو شێوەیە تایبەتە بە دڵنیا بوون لە پڕ كردنەوەی هەردوو بۆشاییەكەی بەشی پێشوو . بۆ بەردەوام بوون دیسان دەتوانن كلیك لەسەر فەرمانی ( Ok) بكەن .



**دوای ئـەوەی کلیـك لەســەر فـەرمانی پێشــوو ، واتــا (Ok) ئەکـەین دەبینین ، دیسان شێوەیەکی ترمان بۆ دەرئەکەوێت ، کە ئەو شێوەیەش هاوشێوەیە لەگەڵ شێوەی پێشوو . بۆ بەردەوام بوون لەو شێوە تازەیە ، دیسان جارێکی تر کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Ok) .**



**وەك بینیمان ، لە بەشەکانی پێشوو چەند فەرمانێکی هاوشێوەمان بۆ دەرکەوت ، لەو فەرمانانەدا کلیکمان لەسەر (Ok) دەکرد ، تا بەردەوام بین لە دانانی بەشەکانی (Microsoft Office 97) ، واتا لە دوای پڕ کردنەوەی دوو بۆشاییەکە (٣ جار) لە دوای یەکتر کلیك لەسەر فەرمانی (Ok) بکەن .**



دوای ئـەوە شـێوەیەكی ترمـان بـۆ دەرئەكـەوێت ، كـە داوای دیـاری كردنی جێگایەكمان لێئەكات ، تا بەشەكانی (Microsoft Office97)مان لەو جێگایە بـۆ دابنـێ . ئێـوە دەتوانـن هـەر ئـەو جێگایـە وەكـو خـۆی بهێڵنەوە ، واتا ئەو جێگایەی كە خۆی دەست نیشانی كردووە . ئەویش بەشـە هـاردی (C: Program File)ە . واتـا دەتوانـن هـەر لەگـەڵ دەركـەوتنی شـێوە تازەكـەدا كلیـك لەسـەر فـەرمانی (Ok) بكـەن ، تـا بەشـەكانی (Microsoft Office 97)تـان لـە نـاو بەشـی (C: Program File) بۆ دابنێ .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Ok) ، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەرئەکەوێت . لەو شێوەیەدا داوای دیاری کردنی بەشەکانی (Microsoft Office 97)مان لێئەکات ، بەلاّم بە چەند شێوەیەك ، ئێوە دەتوانن شێوەی (Typical) هەلّبژێرن . واتا ئەم شێوەیە ئەو بەشانە دادەنێت کە پێویستن هەبێت لە ناو بەشەکانی (Microsoft Office 97).



کاتێك کە کلیك لەسەر فەرمانی (Typical) ئەکەین ، ئەوە لە کاتی دانانەکە تەنها بەشە پێویستەکانمان بۆ ئامادە ئەکات . ئنجا دەبینین دیسان شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت ، لەو شێوە تازەیەدا کلیك لەسەر فەرمانی (Continue) ئەکەین ، بۆ بەردەوام بوون لە دانانی بەشەکانی (Microsoft Office 97) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Continue) دەبینین بۆشاییەکمان بۆ دەرئەکەوێت ، ئێوە ئەبێت چاوەڕوان بن ، تا ئەو بۆشاییە پڕ ئەبێتەوە و ئەبێت بە (١٠٠ ٪) . کاتێك ئەبێت بە (١٠٠٪) دوا فەرمانمان بۆ دەردەچێت ، کە ئەویش دڵنیا بوونە لە تەواو بوونی دانانی (Microsoft Office 97). جا ئێوە دەتوانن بۆ دوا جار کلیك لەسەر فەرمانی (Ok) بکەن .



بەم شێوەیە توانیمان بەسەر کەوتوویی (Microsoft Office 97) لەسەر سیستەمی ویندۆز میلینیۆم دابنێین . ئنجا دوای دانانی بەشەکانی (Microsoft Office 97) دەتوانین هەر بەشێکی بمانەوێت بەکاری بێنین ، ئەویش لە ڕێگای لیستی (ستارت)ەوە ، لە ناو هەڵبژاردەی (Programs) ، کە ئەم بەرنامانە سەر بە (Microsoft Office 97)ن :

١- بەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆرد Microsoft Word

٢- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئەکسڵ Microsoft Excel

٣- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئەکسس Microsoft Access

٤- بەرنامەی مایکرۆسۆفت پاوەر پۆینت Microsoft PowerPoint

٥- بەرنامەی مایکرۆسۆفت پێندر Microsoft Binder

٦- بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئاوت لوک Microsoft Outlook



## چۆنێتی دانانی فۆنتی کوردی Font

دوای دانانی سیستەمی ویندۆز و ، دوای پێناسە کردنی بەشەکانی دەنگ و شاشە و مۆدێم و ئامێری چاپ کردن و دانانی بەشەکانی سەر بە (Microsoft Office 97) ، ئێستا کاتی ئەوە هاتوو بچینە سەر چۆنێتی دانانی ئەو بەشە پێویستانەی تر ، کە بۆ کارەکانمان پێویستن ، وەکو دانانی شێوەی خەتی کوردی (فۆنتەکان) و ، هەروەها بەرنامەی کۆپی کردنی سیدی و ، بەرنامەی نیشاندانی وێنە و ، بەرنامەی گۆرانی بەکارهێنان و ، بەرنامەی فەرهەنگی وەرگێران ( قاموس ) و ، بەرنامەی دژە ڤایرۆس . لە بەشەکانی داهاتوودا ئەم بەشانە و چەند بەشێکی تر باس ئەکەین .

جا ئێستا بۆ ئەوەی بتوانین بە زمانی کوردی نووسین بنووسین، ئەچینە سەر باسی چۆنێتی دانانی فۆنتی کوردی لە ناو سیستەمەکە . دەتوانین بە شێوەیەکی ئاسان ئەم کارە ئەنجام بدەین . بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش ئەبێ لەسەر سیدی یان فلۆپی فۆنتی کوردیمان هەبێ . بۆیە ئێمە بەشێکی تایبەتیمان بە ناوی (Kurdesh Font) واتا فۆنتی کوردی لە ناو ئەو سیدیە داناوە ، کە لەگەڵ ئەم کتێبەدایە . ئێستاش دەتوانین دەست بەکار بین لە زیاد کردنی فۆنتی کوردی بۆ سەر سیستەمی ویندۆز . فەرموون بۆ باس کردنی هەنگاوەکانی دانانی فۆنتی کوردی .

سەرەتا ئەم سیدیەی ، کە لەگەڵ ئەم کتێبەدایە دایدەنێینە ناو بەشی خوێندنەوەی سیدی لە ناو کەیسەکەدا ، ئنجا دوای ئەوە ئەچینە سەر ڕووبەری شاشەکە و لەوێشەوە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) ، کە لە ڕێگای ئەو ئایکۆنەیەوە دەتوانین بچینە سەر سیدیەکە و ناوەڕۆکی سیدیەکە ببینین . ئنجا بۆ کردنەوەی ئەو ئایکۆنەیە دووجار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین .



دوای کردنەوەی ئایکۆنەی (My Computer) دەبینین چەند بەشێك لە ناو ئەو ئایکۆنەیە هەیە . ئێمە دەتوانین بۆ کردنەوەی سیدیەکە بچینە سەر بەشی خوێندنەوەی سیدی ، کە ئەو بەشە لە وێنەکەی ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە . ئنجا دوای ئەوە بە دوو جار کلیکی لای چەپ بەشی سیدی خوێندنەوە ئەکەینەوە ، تا ناوەڕۆکەکەی ببینین و بچینە سەر ئەو بەشەی کە پێویستمان پێی ئەبێ .



دوای کردنـەوەی بەشـی خوێندنـەوەی سـیدی و بینیـنی نـاوەڕۆکی سیدیەکە ، وەکو دیارە لـە ناو ئەو بەشـە زۆر فـایلات هەیـە . ئێمـە بـۆ دانانی ئەو فۆنتە کوردیانەی ، کە لە ناو سیسـتەمی ویندۆز پێویستمان پێـی ئـەبێت، ئەچینـە سـەر فـایلی (Kurdesh Font) و بـە دوو جـار کلیکی لای چەپ ئەو فایلە ئەکەینەوە .



ئنجا دوای ئەوەی بەشی (Kurdesh Font) ئەکەینەوە ، دەبینین جۆرەها فۆنت لە ناو ئەم بەشە هەیە ، وەکو فۆنتی کوردی لە جۆری زانست (Font Zanest) و فۆنتی کوردی لە جۆری علی (Alis Font) و فۆنتی کوردی لە جۆری (Pg Font). بەرێزەکانم ! ئەمانە هەمووی فۆنتی کوردیین ، کە لەو چەند فایلەدا کۆکراونەتەوە ، ئێمە دەتوانین بۆ نووسینی کوردی لە ناو بەرنامەکانی نووسیندا بەکاریان بێنین .



سـەرەتا یـەكێك لـەو سـێ فایلـە ئەكەینـەوە ، بـۆ نموونـە فـایلی (Font Zanest) ئەكەینەوە ، ئنجا ئەچینە سەر شریتی لیستەكان ، كە ئەكەوێتە ژێرەوەی شریتی ناونیشان . لەوێشەوە ئەچینە سەر لیستی (تحریر – Edit) و یەك جار كلیكی لای چەپی لەسەر ئەكـەین ، تا ئـەو لیستەمان بۆ ببێتەوە . ئنجا لە ناو ئەو لیستەدا ئەچینە سەر فەرمانی (Select All) و یەك جار كلیكی لای چەپی لەسەر ئەكەین .



ئەبینین هەموو ئەو فۆنتانەی ، کە لە ناو ئەم بەشەدا هەن دیار ئەبن . واتا ڕەنگی شێوەی فۆنتەکان ئەبێ بە ڕەنگێکی تر ، جا کە دڵنیا بووین لە دیاری کردنی شێوەی فۆنتەکان ، دیسان دەچینە سەر هەمان لیست ، واتا لیستی (Edit) ، لەوێشەوە ئەچینە سەر فەرمانی ( Copy) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، کە ئەم فەرمانە تایبەتە بە لەبەرگرتنەوە ، واتا کاتێك کە کلیك لەسەر فەرمانی (Copy) ئەکەین ، فۆنتە دیاری کراوەکانمان بۆ کۆپی ئەکات .



ئازیزان ! ئنجا تەنها ئەوە ئەمێنێ کە ئەو فۆنتە کۆپی کراوانە بگوازینەوە بۆ شوێنی مەبەست تا لە ناو سیستەمەکەدا جیگیری بکەین بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە و گواستنەوەی فۆنتە کۆپی کراوەکان ئەچینە سەر لیستی (ستارت Start) ، ئەو لیستە ئەکەینەوە ئنجا ئەچینە سەر هەڵبژاردەی (Settings) ، لەوێشەوە ئەچینە سەر (Control Panel) . بۆ کردنەوەی (Control Panel) ، یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین .



ئنجا لە دوای کردنەوەی بەشی (Control Panel) ، ئەبینین ئەو بەشە جۆرەها فایل و شێوەی جۆراو و جۆری تێدایە ، ئێمە بۆ دانانی ئەو فۆنتە کۆپی کراوانە ئەچینە سەر بەشی (Fonts) و ئەو بەشە ئەکەینەوە ، ئەبینین لە ناو ئەم بەشە جۆرەها فۆنتی تێدایە ، وەکو فۆنتی ئینگلیزی و فۆنتی عەرەبی .



بۆ ئەوەی فۆنتە کوردییە کۆپی کراوەکان لە ناو ئەم فۆنتانەدا دابنێین، ئەبێ بچینە سەر شریتی لیستەکان ، لەوێشەوە ئەچینە سەر لیستی ( Edit) و یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر ئەو لیستە ئەکەین ، ئنجا ئەچینە سەر فەرمانی (Paste) و لەسەر ئەو فەرمانە کلیکی لای چەپ ئەکەین ،ئەبینین ئەو فۆنتانەی ، کە لە بەشی پێشوو کۆپیمان کردبوو ، بۆمان دێتە ناو ئەم بەشەوە .

تێبینی : بە هەمان شێوەیە دەتوانین جۆری فۆنتە کوردیەکانی تریش بگوازینەوە بۆ ناو سیستەمەکە .

# چۆنێتی دانانی ویندۆز Windows Xp

خوێنەری بەڕێز ! ئێستاش ئەچینە سەر باس کردنی چۆنێتی دانانی سیستەمی ویندۆز (XP) بۆ ئەو بەڕێزانەی ، کە دەیانەوێ ئەم سیستەمە لەسەر ئامێرەکەیان بەکار بێنن . بە دوو شێوە دەتوانین سیستەمی ویندۆز (XP) دابمەزرێنین . واتا دوو ڕێگا هەیە بۆ چۆنێتی دانانی ئەو سیستەمە :

ڕێگای یەکەم : دەتوانین ئەم سیستەمە لەگەڵ سیستەمی ویندۆز میلینیۆم دابنێین . واتا دەتوانین هەردوو سیستەمەکە بەیەکەوە لەسەر ئامێرەکەدا دابنێن ، هەروەها دەتوانین وەکو تاکە سیستەم دایبنێین و کاری لەسەر بکەین .

بەڕێزەکانم ! ئەگەر بتانەوێت وەکو تاکە سیستەم دایبنێن ، ئەوە دەتوانن لە ڕێگای (MS DOS) ئەو کارە ئەنجام بدەن . کە ئەویش دەبێت ئەو سیستەمە شێوەی (BOOT) بێت ، واتا لەگەڵ چوونە سەر (MS DOS) ڕاستەوخۆ داوای دانانی سیستەمەکە بکات .

ڕێگای دووەم : دەتوانن سیستەمی ویندۆز (XP) لەسەر سیستەمی (ویندۆز میلینیۆم) دابنێن ، کە ئەویشیان هەر بە هەمان شێوەی پێشوو دەبێت بە دوو ڕێگا : ڕێگایەکیان سیستەمی (ویندۆز میلینیۆم)ەکە لا ئەبات و تەنها سیستەمی ویندۆز (XP) دەمینێتەوە . ڕێگاکەی تریان سیستەمی ویندۆز (XP) زیاد ئەکاتە سەر سیستەمی ویندۆز میلینیۆم و ئەبن بە دوو سیستەم ، دەتوانین لەسەر هەردوو سیستەمەکە کار بکەین، واتا هەردوو سیستەمەکە لە ناو ئامێرەکەدا جێگیر ئەبن و کاریان پێ ئەکرێت .

بۆ دانانی ئەو سیستەمە دەبێت سیدیی (Windows XP)تان هەبێت، تا بتوانن ئەو سیستەمە لەسەر ئامێرەکەتان دابنێن.

بۆ دانانی سیستەمی (Windows Xp) بە ڕێگای دووەم ، واتا لە سەر سیستەمی ویندۆز میلینیۆم ، دەبێت کۆمپیوتەرەکە پێ کرا بێت و چووبێتە سەر ڕووبەری شاشەکە . واتا دوای ئەوەی کە سیستەمی ویندۆز میلینیۆم دێتە سەر ڕووبەری شاشە ، ئنجا دەبێت سیدی (Windows Xp) دابنێیتە سەر بەشی خوێندنەوەی سیدی لە ناو کەیسەکەدا ، بۆ ئەوەی بتوانیت ئەو سیستەمە تازەیە دابنێن .

دوای دانانی سیدی سیستەمی (Windows Xp) لە ناو بەشی خوێندنەوەی سیدی لە ناو کەیسەکەدا ، دەبینین شێوەیەکی تایبەت بەو سیستەمە تازەیە دێتە سەر ڕووبەری شاشەکە ، کە فەرمانەکانی دانانی سیستەمەکەی تێدایە . بەڵام ئەگەر ئەو شێوە ڕاستەوخۆیە نەهاتە سەر ڕووبەری شاشەکە ، ئەوە ئەچینە سەر ڕووبەری شاشەی (ویندۆز میلینیۆم) ، لەوێشەوە ئەچینە سەر ئایکۆنەی (My Computer) . لە ناو ئەو ئایکۆنەیە ئەچینە سەر بەشی سیدی خوێندنەوە و دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا شێوە ڕاستەوخۆیەکە ( AUTORUN ) بێتە سەر ڕووبەری شاشەکە .



دوای هاتنی شێوه ڕاستەوخۆیەکە (AUTORUN ) بۆ سەر ڕووبەری شاشە دەبینین ، کە ئەم شێوەیە چەند فەرمانێکی لەسەرە ، ئەوەی کە پێویست بێت بۆ کارەکەی ئێمە ، واتا بۆ دانانی سیستەمی (Windows Xp) فەرمانی (Install Windows Xp)یە ، کە ئەم فەرمانە تایبەتە بە دانانی سیستەمە تازەکە . ئێوەی بەڕێز ئەتوانن لەسەر ئەم فەرمانە یەك جار کلیکی لای چەپ بکەن بۆ بەردەوام بوون .



دوای کلیك کردن لەسەرفەرمانی (Install Windows Xp) شێوەیەکی ترمان بۆ دەرئەکەوێت ، لەو شێوە تازەیەدا بۆشاییەك ئەبینین ، کە دوو فەرمانی تێدایە . فەرمانێکیان تایبەتە بە چۆنێتی دانانی سیستەمی (Windows Xp) بە شێوەی لابردنی سیستەمە کۆنەکە . واتا ئەگەر کلیك لەسەر ئەم فەرمانە بکەین بەردەوام دەبێت لە دانانی سیستەمە تازەکە ، بەڵام لە کۆتاییدا سیستەمە کۆنەکە لائەبات و وەکو سیستەمێکی تاك ئەمینێتەوە . ئەگەر بمانەوێ هەردوو سیستەمەکە بمێنێت و کار لەسەر هەردووکیان بکەین ، ئەوە لە لاپەڕەی داهاتوودا باسی ئەکەین .



بەڕێزان ، هەر وەك لەبەشی پێشوو باسی دانانی سیستەمەکەمان کرد بە شێوەی تاکە سیستەم ، ئەم جارەیان و لەم بەشەدا بۆ دانانی هەردوو سیستەمەکەش ئەتوانین لە بۆشایی (Install Type) کلیك لەسەر سێگۆشەی بۆشاییەکە بکەین و فەرمانی (New Installitaon Advanced) هەڵبژێرین و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین . بەم شێوەیە دەتوانین هەردوو سیستەمەکە لەسەر ئامێرەکەدا دابنێن ، دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next) بۆ بەردەوام بوون .



لە دوای هەڵبژاردنی شێوەی دانانی سیستەمی (Windows Xp) بەو شـــێوەیەی ، کـــە سیســـتەمە کۆنەکـــەش بمێـــنێ ، فـــەرمانی (New Installitaon Advanced)مان هەڵبژارد و، بۆ بەردەوام بـوون کلیکمان لەسەر فەرمانی (Next) کرد، شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێ ، کە لە ژێرەوەی شێوەکە دوو بازنەی بچووك هەیە . جا ئێوەی بەرێز ئەتوانن بۆ بەردەوام بوون بە ماوسەکە بازنەی سەرەوە هەڵبژێرن ، هەر وەك لە وێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە ، ئنجا بۆ بەردەوام بوون کلیك لەسەر فەرمانی (Next) بکەن.



لە دوای هەڵبژاردنی بازنەکەی سەرەوە لە شێوەی پێشوو . هەروەها لە دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) ، ئێستا شێوەیەکی تر ئەبینین، کە چەند بۆشاییەکی تێدایە . پێویستە ئەو چەند بۆشاییە بە ژمارەی نهێنی تایبەت بە (Windows Xp) پڕ بکەینەوە ، ئێمە ئەو ژمارە نهێنیانەمان بۆتان ئامادە کردووە و لە ناو بۆشاییەکان نووسیومانە ، ئێوەش بە هەمان شێوە ئەم ژمارانە بنووسنەوە .



لـە دوای پڕکردنـەوەی بۆشـاییەکان و نووسـینی ژمـارە نهێنیـەکانی (Windows Xp) ، یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Next) ئەکەین بۆ بـەردەوام بـوون . دوای ئـەوە دیسـان شـێوەیەکی ترمـان بـۆ دەرئەکەوێ ، کە ئەو شێوەیە بۆشاییەکی تێدایە ، ئەو بۆشاییە چـەند شـێوەیەکی زمانـەوانی تێدایـە ، ئـەو شـێوە تازەیـە داوای هـەڵبژاردن و دانانی شێوەی زمانەوانی دەکـات ، تـا سیسـتەمەکە بـەو شـێوە زمانـە دابنێت ، ئێوە ئەتوانن شێوەی زمانی ئینگلیزی هەڵبژێرن .



**لە دوای هەڵبژاردنی شێوەی زمانەوانی لە بەشی ڕابردوو کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) بۆ بەردەوام بوون . دیسان شێوەیەکی تازەمان بۆ دەرئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا ئەتوانن ڕاستەوخۆ بازنەی ژێرەوە هەڵبژێرن و یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Next) بکەن بۆ بەردەوام بوون لەسەر دانانی سیستەمی (Windows Xp) .**



دوای ئەوەی کە بازنەی ژێرەوەمان لە شێوەی پێشوو دیاری کرد و کلیکمان لەسەر فەرمانی (Next) کرد ، ئێستا شێوەیەکی تر ئەبینین ، کە ئەم شێوەی ئەم جارەمان جیاوازی هەیە لەگەڵ شێوەکانی پێشتر . مەبەستیش لە جیاوازی ئەوەیە ، کە شێوەی بۆشاییەکمان بۆ دەرئەکەوێ ، ئەبێ چاوەڕوان بین تا ئەو بۆشاییە بە تەواوی پڕ ئەبێتەوە و ئەبێت بە (١٠٠ ٪) . ئنجا لە دوای پڕ بوونەوەی شێوەکە ئەبینین ڕاستەوخۆ ئامێرەکە (Restart) ئەبێتەوە ، واتا ئەکوژێتەوە و هەر خۆی پێ ئەبێتەوە .



دوای (Restart) بوونەوەی ئامێرەکە و کاتیٚ ئەچێتە سەر سیستەمی (MS. DOS) دوو فەرمان ئەبینین ، کە تایبەتن بە سیستەمەکان . واتا هەردوو سیستەمەکەمان بە شێوەی نووسین نیشان ئەدات ، ئێوەی بەڕێز ئەتوانن سیستەمی (Windows Me) هەڵبژێرن و بچنە سەر ئەو سیستەمە ، یان ئەتوانن سیستەمی (Windows XP) هەڵبژێرن ، تا بەردەوام بن لە تەواو کردنی دانانی ئەو سیستەمە . ئنجا کاتێك ئەم جۆرە فەرمانەتان بینی ئەوە ئەتوانن ڕاستەوخۆ کلیلی (Enter) لەسەر کیبۆردەکە دابگرن بۆ بەردەوام بوون لە دانانی (Windows XP) .

دوای ئەوە ئەبینین شاشەی ئامێرەکە ڕەنگی شین ئەبیٚ و فەرمانەکان لە سەر ئەو شاشە شینە ئەبینین . بۆ نموونە بڕوانە بەشی ژێرەوەی شاشە شینەکە ، ئەبینی داوای فەرمانێك ئەکات ، ئێوە بە بەردەوامی ئەبێت بڕواننە ژێرەوەی شاشەکە ، چ فەرمانێك ببینن ئەوە ئەو کلیلە لەسەر کیبۆردەکە بەکاربێنن .

بۆ نموونە ئێستا ئەبینین لە ژێرەوەی شاشەکە فەرمانێك هەیە داوامان لیٚ ئەکات بۆ بەردەوام بوون کلیلی (Enter) بەکاربێنین ، ئنجا ئەبینین شێوەی بۆشاییەکمان بۆ دەرئەکەویٚ کە پێداچوونەوەیەك بە بەشە هاردەکان ئەکات ، تا بزانیٚ ئەو سیستەمە تازەیە لە کام بەشە هارد دابنیٚ . ئەو کارە هەر بە خێرایی ئەنجام ئەدات، واتا شێوەی بۆشاییەکە بە خێرایی پڕ ئەبێتەوە ، بەڵام دوای ئەوە دیسان لە ژێرەوەی شاشەکە فەرمانێکی هاوشێوەمان لەگەڵ فەرمانەکەی پێشوو بۆ دەرئەکەویٚ ، واتا دیسان داوای بەکارهێنانی فەرمانی (Enter)مان لیٚ ئەکات بۆ ئەوەی بەشەکانی سیستەمە تازەکەمان بۆ کۆپی بکاتە ناو ئەو بەشە هاردەی ، کە لە پڕ بوونەوەی بۆشایی پێشوو دیاری کردبوو ، ئنجا کاتیٚ کە ئەو

کلیله لەسەر کیبۆردەکە دائەگرین ، دیسان بۆشاییەك ئەبینین ، کە بۆشایی ئەم جارەمان کەمێك کاتی زیاتر ئەویٚ بۆ پڕ بوونەوەی . واتا ڕەنگە چەند خولەکێکی پیٚ بچێت تا تەواو بۆشاییەکە پڕ ئەبێتەوە ، بەڵام ئەبێت چاوەڕوان بن ، تا تەواو بوونی کارەکەی ، واتا پڕ بوونەوەی بۆشاییەکە . دوای ئەوە ئەبینین لە دوای پڕ بوونەوەی شێوەکە ڕاستەوخۆ ئامێرەکە (Restart) ئەبێتەوە . ئنجا دیسان بڕواننە ژێرەوەی شاشەکە و بزانن ئەم جارەیان بۆ بەردەوام بوون لە دانانی سیستەمی (Windows XP) ، چ فەرمانێك داوا ئەکات .

بەم شێوەیە بەردەوام بە تا فەرمانەکانی تریش بەهەمان شێوە ئەنجام ئەدەیت .

خوێنەری خۆشەویست ! لە دوای پیٚ بوونەوەی ئامێرەکە ئەبینین لە لا تەنیشتێکی ڕووبەری شاشەکە بۆشاییەکی بچووکمان بۆ دەرئەکەویٚ ، ئەو بۆشاییە خۆی دەست بەکار ئەبیٚ لە دانانی سیستەمە تازەکە . واتا کاتیٚ ئەو بۆشاییە پڕ ئەبێتەوە ، ئەوە بە مانای ئەوە دێت کە بەردەوامە لە دانانی سیستەمە تازەکە . چاوەڕوان بن تا تەواو ئەبیت و چەند جارێك ئەو جۆرە بۆشاییەمان بۆ دەرئەچێت و پڕ ئەبێتەوە ، ئێوە هەر چاوەڕوان ئەبن ، تا ئەو کاتەی شێوەیەکتان بۆ دەرئەچێت ، کە داوای دانانی شێوەی زمانەوانیمان لیٚ ئەکات . ئێوە ئەتوانن بۆ هەڵبژاردنی شێوەی زمانەوانی لە بۆشایی شێوەکە زمانی (E) هەڵبژێرن ، ئنجا بۆ بەردەوام بوون لە دانانی سیستەمی (Windows XP) ، لە ژێرەوەی شێوەکە کلیك لەسەر فەرمانی (Next) بکەن . دوای ئەوەش دیسان شێوەیەکی تر ئەبینین . لەم شێوەیەدا دوو بۆشایی ئەبینین ، کە تایبەتن بە دانانی ناو و ناوی کۆمپانیا . واتا ئەتوانن لە بۆشایی یەکەمی

سەرەوە ، واتا بۆشایی (Name) ناوێك بنووسن و گرنگ نیە ئەو ناوە چی بێت . ئەتوانن هەر ناوی خۆتان بنووسن . بۆشایی دووەمیش لە ژێرەوە ، واتا بۆشایی (Organization) تایبەتە بە ناوی کۆمپانیا ، یان دەزگا ، یان فەرمانگە ، یان هەر جیگایەکی تر ، ئەتوانن ناوی کۆمپانیایەك بنووسن . دوای ئەوەی هەردوو بۆشاییەکە پڕ ئەکەنەوە ، لە ژێرەوەی شێوەکە کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) بۆ بەردەوام بوون .

لە دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی تر ئەبینن ، کە ئەم شێوەیەش تایبەتە بە کارێکی تری سیستەمی (Windows XP)، ئەم کارەش دانانی وشەی نهێنیە بۆ سیستەمە تازەکە . واتا لەم شێوەیەدا چەند بۆشاییەك ئەبینین ، کە داوامان لێ ئەکات -ئەگەر بمانەوێ- وشەیەکی نهێنی بۆ سیستەمی (Windows XP) دابنێین . ئەتوانین لە ناو ئەو بۆشاییانەدا ناوێك یان وشەیەکی نهێنی بنووسین ، بۆ ئەوەی هەر کەسێك ویستی کار بەو سیستەمە بکات ، بە بێ نووسینی ئەو ناوە یان وشە نهێنیە نەتوانێت بچێتە سەر ئەو سیستەمە . بەڵام ئەگەر نەتان ویست وشەی نهێنی بۆ سیستەمە تازەکە دابنێن ، ئەوە ئەتوانن هەر لەگەڵ دەرکەوتنی شێوە تازەکە ڕاستەوخۆ و یەکسەر بە بێ پڕ کردنەوەی بۆشاییەکان کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) ، ئەوە ڕاستەوخۆ ئەچێتە سەر بەشێکی تر ، واتا هیچ وشەیەکی نهێنی ، یان ناوێکی نهێنیت بۆ دانانێت ، بەڵکو ئەچێتە سەر بەردەوام بوون لە دانانی سیستەمە تازەکە.

دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی تر ئەبینن ، ئەو شێوەیەش تایبەتە بە دیاریکردنی کات و بەروار . ئێوەی بەڕێز ئەتوانن

ئەو کات و بەروارە هەڵبژێرن ، کە ئارەزوتان لێی هەیە ، واتا گرنگ نیە ئەگەر هەر کاتێك ، یان بەروارێك هەڵبژێرن ، ئەتوانن بەرواری ئەو کاتە دابنێن ، کە دەست بەکار بوون لە دانانی سیستەمە تازەکە. هەروەها ئەتوانن کات و بەروارێك دابنێن ، کە ڕابردوو بێت ، یان هەر کاتێك و هەر بەروارێك ، یان هەر ڕاستەوخۆ ، کە شێوە تازەکە دەرکەوت ئەوە ئەتوانن کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) ، بۆ ئەوەی لە دانانی سیتەمە تازەکە بەردەوام بێت و خۆی کات و بەروارەکەی بۆ دابنێت .

دوای ئەوە دیسان شێوەیەکی تر ئەبینین ، کە دوو بازنەی تێدایە ، ئەو شێوە بازنەیانە داوای دانانی سیستەمی (Windows XP) ئەکات بە چەند جۆرێك . ئێوە ئەتوانن بۆ دانانی سیستەمە تازەکە بە شێوەیەکی نموونەیی بازنەی سەرەوە هەڵبژێرن (Typical Setting ) و بە ماوسەکە دیاری بکەن . ئنجا بۆ بەردەوام بوون کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) .

دوای ئەوە دیسان شێوەیەکی تر دەرئەکەوێت ئەتوانن ڕاستەوخۆ کلیك لەسەر فەرمانی (Next) بکەن بۆ بەردەوام بون لەسەر دانانی سیستەمی (Windows Xp) .

ئنجا دەبینین شێوەی بۆشاییەکمان بۆ دەرئەکەوێ ، ئەو شێوەی بۆشاییە هەر بۆ خۆی پڕ ئەبێتەوە ، ئەوەش نیشانەیە لە بەردەوام بوونی دانانی سیستەمە تازەکە . چەند جارێك ئەو شێوەی بۆشاییە دەردەکەوێت و پڕ ئەبێتەوە ، ئێوە تەنها ئەتوانن چاوەڕێ بکەن تا ئەو کاتەی ئامێرەکە بۆ جارێکی تر (RESART) ئەبێتەوە .

دوای پێ بوونەوەی ئامێرەکە دەبینین لە ناو (MS. Dos) شێوەی دوو سیستەم دەرئەکەوێت . ئێوە ئەتوانن سیستەمی

(Microsoft Windows Xp) هەڵبژێرن و لەسەر کیبۆردەکە کلیلی (Enter) دابگرن بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر هەنگاوەکانی کۆتایی دانانی سیستەمی (Windows Xp) . جا هەندێك چاوەڕوان بن ، تا شێوەیەکمان بۆ دەرئەکەوێت ، ئنجا بۆ بەردەوام بوون کلیك لەسەر فەرمانی ( OK) بکەن. دیسان جارێکی تر بۆ بەردەوام بوون کلیك لەسەر فەرمانی ( OK) بکەن. ئنجا لە بەشی ژێرەوەی شێوەکە کلیك لەسەر فەرمانی (Next) بکەن ، ئنجا دیسان جارێکی تر کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) ، ئنجا دوای ئەوە شێوەیەکی تر ئەبینن ، کە داوا ئەکات وشەیەکی نهێنی بۆ سیستەمە تازەکە دابنێیت ، ئەتوانن وشەی نهێنی دانەنێن ، واتا ئەگەر ئەم شێوەیەتان بۆ دەرکەوت و نەتانویست وشەی نهێنی ( پاسۆورد ) دابنێن ، ئەوە لە شێوەکەدا دوو بازنە ئەبینن، بازنەی ژێرەوە هەڵبژێرن و کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Next) بۆ بەردەوام بوون .



# چۆنێتی بەکارهێنانی بەرنامەی نیرۆ Nero

خوێنەری خۆشەویست ! ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر باسی بەرنامەیێکی تری گرنگ لە بەرنامەکانی ئامێری کۆمپیوتەر . باسی ئەم جارەمان تایبەت ئەبێت بە بەرنامەی کۆپی کردنی سیدی ، بە مەرجێك ئەبێت ئەو کەسەی ئەم بەرنامەیە دادەنێت ، یان بەکاری دێنێت، (سیدی رایتەر)ی هەبێت . واتا بە بێ (سیدی رایتەر) ئەم بەرنامەیە هیچ کارێکی پێ ناکرێت. هەروەها وەك دەزانین بەرنامەکانی ئامێری کۆمپیوتەر زۆرن ، لە ڕووی ئاسان کاریەوە ، بۆ ئەنجام دانی هەر کارێك لە ناو ئامێری کۆمپیوتەر و لە بارەی کۆپی کردنی سیدیشەوە بەرنامەی زۆر هەن ، ئەو بەرنامانە لە ڕووی کار کردنەوە جۆرا و جۆرن ، بەڵام ئێمە بە باشی دەزانین ، کە بەرنامەیێکی باش و ڕێکوپێکی وەکو بەرنامەی (Nero) ، کە بەرنامەێیکی یەکجار بەناوبانگ و گرنگە ، بۆ خوێنەرانی باس بکەین ، بەو هیوایەی کە سوود بەخش بێت و، ئاسانکارێکی زۆرتان بۆ بخەینە بەرچاو ، هەر لە بارەی دانانی بەرنامەکەوە تا کار کردن لە سەر بەرنامەکە و چۆنێتی کۆپی کردنی سیدی بە هەموو جۆرەکانیەوە . مەبەستیش لە وشەی جۆرەکانی ئەوە دەگرێتەوە ، کە ئەم بەرنامەیە دەتوانێت کاری کۆپی لە سیدییەکەوە بۆ سیدییەکی تر بکات . هەروەها بە هۆی ئەم بەرنامەیەوە دەتوانیت هەر شتێکی گرنگ لە ناو هاردی کۆمپیوتەرەکەدا هەبێت بیخەیتە سەر سیدیەکی بەتاڵ . هەروەها دەتوانێت سیدیەکی دەنگ یان دەنگ و ڕەنگ لە ڕێگای ئەم بەرنامەیە کۆپی بکەیت .

# بەرنامەی Nero Express

## ١- ناسینی ڕووبەری بەرنامەی Nero Express

لە پێنج ( ٥ ) بەش پێک هاتووە وە هەر یەکێک لەم چەند بەشە کارێکی تایبەتی ئەنجام ئەدات .

1- Data
2 - Music
3 - Videos / Pictures
4 - Copy Entire Disc
5 - Disc Image or Saved Project



١- کۆپی کردن لە ڕێگای هارد ، واتا ئەو شتانەی کە لە ناو ئامێرەکەدا خەزن کراون یان لە ناو بەشە هاردەکاندا هەن چۆن بیگوازینەوە بۆ سەر سیدیەکی بەتاڵ ، کە ئەو کردارە بە هۆی فەرمانی یەکەمەوە ئەبێت فەرمانی Data.

سەرەتا دوای کردنەوەی بەرنامەی نیرۆ Nero Express ئەچینە سەر فەرمانی Data و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ لەسەر ئەو فەرمانە ئەکەین ، ئەبینین ئەو فەرمانە دوو بەشی لێ ئەبێتەوە ، ئنجا لەسەر فەرمانی یەکەمیان Data Disc کلیکی لای چەپ ئەکەین ، ئەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەر ئەکەوێ .



کە کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Data Disc) ئەکەین ، ئەبینین ئەم شێوەیەمان بۆ دەرئەکەوێت ، کە لە وێنەی ژێرەوەدا ئاماژەمان پێی کردووە . ئنجا ئەچینە سەر فەرمانی (Add) و لەوێش یەك جار کلیکی لای چەپ ئەکەین ، تا شێوەیەکی ترمان بۆ دەئەکەوێ ، ئنجا لەو شێوەیەدا و لە بەشی (Location) ئەو شوێنە هەڵئەبژێرین ، کە فایلەکانمان تێدا پاراستووە . بۆ نموونە ئەگەر لە بەشە هاردی (D : /) فایلەکانت پاراستبوو ، ئەوا لە بەشی (Location) بەشی (Local Disk D : ) هەڵبژێرە و لە بۆشایی ژێرەوەش فایلەکانت یەك یەك دەستنیشان بکە و، جارێکی تر کلیك بکە لەسەر (Add) ، ئنجا دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Finished) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Finished) بڕوانە ئەو شریتەی ، کە ئەکەوێتە خوارەوەی ڕووبەری بەرنامەکە ، ئەبێت ڕەنگی شین نەگاتە ئاست ڕەنگی سوور . چونکە ئەگەر بگاتە ئاستی ڕەنگی سوور ، واتا لەسەر سیدیەکە جێگای نابێتەوە . بەڵام ئەگەر تا ئاستی ڕەنگە زەردەکە بوو ، ئەوە مانای ئەوەیە ، کە لەسەر سیدیەکە جێگای ئەبێتەوە ، دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی ترمان بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوەیەدا ئەبێت لە بۆشایی سەرەوە ، واتا لە بۆشایی (Current Recorder) ئەو شوێنە هەڵبژێرین ، کە (سیدی رایتەر)ەکەی پێ ناسراوە . واتا یان (:F) یان (:G) یان (:H) ، کە زۆر جاری وا هەیە هەر بەرنامەکە بۆ خۆی ئەو بەشە دەستنیشان ئەکات . ئنجا دوای ئەوە لە بۆشایی ژێرەوە (Disc Name) ناوێك بنووسە ، چونکە ئەو ناوە ئەبێت بە ناونیشانی سیدیەکە .



دوای دانانی ناوێك لە بۆشایی (Writing Speed) ، خێرایی کۆپی کردنەکە دەستنیشان بکە ، کە خێراییەکەی بۆ کۆپی کردن تا کەم تر بێت باشترە ، واتا یان (١٦) یان (٢٤) ، ئەوسا بە شێوەیەکی ئاسایی کاری کۆپی کردن ئەنجام ئەدات ، ئنجا لە بۆشایی (Number Of Copies) چەند سیدیت پێویست ئەبێت ئەو ژمارەیە دیاری بکە . لە کۆتاییدا ئەو دوو چوار گۆشە بچووکەی کە ئەکەوێتە ژێرەوە ، بە کلیك کردن هێمای ڕاستیان لەسەر هەڵبگرە ، واتا چوارگۆشەکان وەك ئەو شێوە بێت ، کە لە وێنەکەی ژێرەوە ئاماژەم پێی کردووە ، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Burn) تا دەست بەکار بێت لە کرداری کۆپی کردنەکە و چاوەڕوان بە ، تا کۆتایی کارەکە واتا تا ئەبێت بە ١٠٠٪ .



٢- کۆپی کردنی گۆرانی ، یان بەشی دەنگ لە ڕێگای هارد ، واتا ئەو گۆرانیانەی لە ناو ئامێرەکەدا خەزن کراون ، یان لە ناو بەشە هاردەکاندا هەن ، چۆن بیگوازینەوە بۆ سەر سیدیەکی بەتاڵ . ئەو کردارە بە هۆی فەرمانی دووەمەوە ئەبێت ، فەرمانی (Music) .

بۆ کۆپی کردنی گۆرانی دەنگ ، ئەگەر ئەو گۆرانیە (Wave) یان (Mp3) یان (Wma) بوو ، ئەتوانین ئەو کارە لە ڕێگای بەشی (Music) ئەنجام بدەین . بۆ نموونە ئەگەر لە ناو هاردەکانی ناو کۆمپیوتەرەکە گۆرانی (Mp3) هەبوو ، ویستت ئەو گۆرانیانە بگوازیتەوە بۆ سەر سیدیەکی بەتاڵ ، ئەوە لە بەشی (Music) ئەچیتە سەر بەشی (Mp3 Disc) ، لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ ئەکەیت .



کە کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Mp3 Disc) ئەکەین ، ئەو شێوەیەمان بۆ دەرئەکەوێت ، کە لە وێنەی ژێرەوەدا ئاماژەمان پێی کردووە . ئنجا ئەچینە سەر فەرمانی (Add) و یەك جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، شێوەیەکی ترمان بۆ دەر ئەکەوێ . ئنجا لەو شێوەیەدا و لە بەشی (Location) ئەو شوێنە هەڵئەبژێرین کە گۆرانیەکانمان تێدا پاراستووە . بۆ نموونە ئەگەر لە بەشە هاردی (D:/) گۆرانیەکانت پاراستبوو ، ئەوا لە بەشی (Location) بەشی (Local Disk D :) هەڵبژێرە، لە بۆشایی ژێرەوەش گۆرانیەکانت یەك یەك دەستنیشان بکە و، جارێکی تر کلیك بکە لەسەر (Add) ، دوای ئەوە کلیك لەسەر فەرمانی (Finished) بکە.



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Finished) بڕوانە ئەو شریتەی ، کە ئەکەوێتە خوارەوەی ڕووبەری بەرنامەکە ، ئەبێت ڕەنگی شین نەگاتە ئاست ڕەنگی سوور . ئەگەر بگاتە ئاستی ڕەنگی سوور ، واتا لەسەر سیدیەکە جێگای نابێتەوە ، بەڵام ئەگەر تا ئاستی ڕەنگە زەردەکە بوو ، ئەوە مانای ئەوەیە کە لەسەر سیدیەکە جێگای ئەبێتەوە ، ئنجا کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next)



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی ترمان بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوەیەدا ئەبێت لە بۆشایی سەرەوە ،واتا لە بۆشایی (Current Recorder) ئەو شوێنە هەڵبژێرین ، کە (سیدی رایتەر)ەکەی پێ ناسراوە ، واتا یان (:F) یان (:G) یان (:H) ، کە زۆر جاری وا هەیە هەر بەرنامەکە بۆ خۆی ئەو بەشە دەستنیشان ئەکات ، دوای ئەوە لە بۆشایی ژێرەوە (Disc Name) ناوێك بنووسە ، چونکە ئەو ناوە ئەبێت بە ناونیشانی سیدیەکە.



دوای دانانی ناوێك لە بۆشایی (Writing Speed) ، خێرایی كۆپی كردنەكە دەسنیشان بكە . خێرایی كۆپی كردن تا كەم تر بێت باشترە ، واتا یان (١٦) یان (٢٤) بێت ، ئەوا بە شێوەیەكی ئاسایی كاری كۆپی كردن ئەنجام ئەدات . ئنجا لە بۆشایی (Number Of Copies) چەند سیدیت پێویست ئەبێت ئەو ژمارەیە دیاری بكە ، لە كۆتایی دا ئەو دوو چوارگۆشە بچووكەی ، كە ئەكەوێتە ژێرەوە هێمای ڕاستیان لەسەر هەڵبگرە بە كلیك كردن . واتا چوارگۆشەكان بەو شێوە بێت كە لە وێنەكەی ژێرەوە ئاماژەم پێی كردووە ، ئنجا كلیك بكە لەسەر (Burn) ، تا دەست بەكار بێت لە كرداری كۆپی كردنی سیدی گۆڕانیەكە و چاوەڕوان بە ، تا كۆتایی كارەكە واتا تا ئەبێت بە ١٠٠ ٪ .



٣- کۆپی کردنی گۆرانی دەنگ و ڕەنگ لە ڕێگای هارد ، واتا ئەو گۆرانیە دەنگ و ڕەنگیانەی ، کە لە ناو ئامێرەکەدا خەزن کراون ، یان لە ناو بەشە هاردەکاندا هەن ، چۆن بیگوازینەوە بۆ سەر سیدیەکی بەتاڵ ، کە ئەو کردارە بە هۆی فەرمانی سێهەمەوە ئەنجام دەدرێت، فەرمانی (Videos / Pictures) .

بۆ کۆپی کردنی گۆرانی دەنگ و ڕەنگ ( کلیپ ) ، ئەتوانین ئەو کارە لە ڕێگای بەشی (Videos / Pictures) ئەنجام بدەین . بۆ نموونە ئەگەر لە ناو هاردەکانی ناو کۆمپیوتەرەکە گۆرانی دەنگ و ڕەنگ ( کلیپ ) هەبوو ، ویستت ئەو گۆرانیانە بگوازیتەوە بۆ سەر سیدیەکی بەتاڵ ، ئەوە لە بەشی (Videos / Pictures) ئەچیتە سەر بەشی (Video Cd) و لەوێ یەك جار کلیکی لای چەپ ئەکەیت .



کە کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی (Video Cd) ئەکەین ، ئەبینین ئەم شێوەیەمان بۆ دەرئەکەوێت ، کە لە وێنەی ژێرەوەدا ئاماژەمان پێی کردووە . ئنجا ئەچینە سەر فەرمانی (Add) و جار کلیکی لای چەپی لەسەر ئەکەین ، تا شێوەیەکی ترمان بۆ دەرئەکەوێ . لەو شێوەیەدا و لە بەشی (Location) ئەو شوێنە هەڵئەبژێرین ، کە گۆرانیەکانمان تێدا پاراستووە . بۆ نموونە ئەگەر لە بەشە هاردی (/ : D) گۆرانیەکانت پاراستبوو ، ئەوا لە بەشی (Location) بەشی (: Local Disk D) هەڵبژێرە و، لە بۆشایی ژێرەوەش گۆرانیەکانت یەك یەك دەستنیشان بکە و، جارێکی تر کلیك بکە لەسەر (Add) ، دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Finished) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Finished) ئەبینی شێوەکە ئەگۆڕێت و شێوەیەکی تر دەر ئەکەوێت ، ئنجا گۆرانیە دەنگ و ڕەنگیەکانت لەو شێوە تازەیەدا نیشان ئەدات ، ئەتوانی یەك یەك گۆرانیە دەنگ و ڕەنگیەکان تاقی بکەیتەوە بۆ دڵنیا بوون لە تەواوی جۆری گۆرانیەکە ، ئنجا دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی ترمان بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوەیەدا ئەبێت لە بۆشایی سەرەوە . واتا لە بۆشایی (Current Recorder) ئەو شوێنە هەڵبژێرین ، کە (سیدی ڕایتەر)ەکەی پێ ناسراوە ، واتا یان (:F) یان (:G) یان (:H) ، کە زۆر جاری وا هەیە هەر بەرنامەکە بۆ خۆی ئەو بەشە دەستنیشان ئەکات . ئنجا دوای ئەوە لە بۆشایی ژێرەوە (Disc Name) ناوێك بنووسە ، چونکە ئەو ناوە ئەبێت بە ناونیشانی سیدیەکە.



ئنجا دوای دانانی ناوێك لە بۆشایی (Writing Speed) خێرایی کۆپی کردنەکە دەسنیشان بکە ، خێرایی کۆپی کردن تا کەم تر بێت باشترە ، واتا یان (١٦) یان (٢٤) بێت ، ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی کاری کۆپی کردن ئەنجام ئەدات . ئنجا لە بۆشایی (Number Of Copies) چەند سیدیت پێویست ئەبێت ئەو ژمارەیە دیاری بکە .



دوای دیاری کردنی ژمارەی سیدییەکانت و لە کۆتایی دا ، ئەو دوو چوار گۆشە بچووکەی ، کە ئەکەوێتە ژێرەوە هێمای ڕاستیان لەسەر هەڵبگرە بە کلیك کردن . واتا چوارگۆشەکان وەك ئەو شێوە بێت ، کە لە وێنەکەی بەشی پێشوو ئاماژەم پێی کردووە ، ئنجا کلیك بکە لەسەر (Burn) ، تا دەست بەکار بێت لە کرداری کۆپی کردنی سیدی گۆرانیەکە و چاوەڕوان بە ، تا کۆتایی کارەکە . واتا تا ئەو کاتەی ئەو دوو بۆشاییەی ، کە لە وێنەی ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە ئەبێت بە ١٠٠ ٪ .



٤-كۆپی كردنی سیدی بۆ سیدی ، واتا ئەگەر ویستت سیدیەكی پڕ كە بەرنامە یان گۆرانی دەنگ ، یان گۆرانی دەنگ و ڕەنگ ، یان یاری یان هەر سیدیەكی تر ، كە تایبەت بێت بە ئامێری كۆمپیوتەر ، بگوازیتەوە بۆ سەر سیدیەكی بەتاڵ ، ئەو كردارەش بە هۆی فەرمانی چوارەمەوە ئەنجام دەدرێت ، فەرمانی (Copy Entire Disc) .

سەرەتا ئەگەر ویستت سیدییەك كۆپی بكەیت ، كە نسخەیەكی لە لات هەیە ، ئەوە دەتوانی ئەم كارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەیت :

سیدی نسخەكە لە ناو سیدی ڕوومەكە دانێ لە ناو كەیسی كۆمپیوتەرەكە ، دوای ئەوە سیدییەكی بەتاڵ لە ناو ڕایتەرەكە دانێ لە ناو كەیسی كۆمپیوتەرەكە ، ئنجا دوای ئەوە بچۆرە سەر كردنەوەی بەرنامەكە .



بە هۆی ماوسەکە دوو جار کلیکی لای چەپ بکە لەسەر بەرنامەکە ، وەك چۆن لە وێنەی بەشی پێشوو ئاماژەم بۆی کردووە . ئنجا دوای کردنەوەی بەرنامەکە ڕووبەری ئەو بەرنامەیە ئەبینی ، ئەبینی کە چەند فەرمانێك هەیە بۆ ئەنجامدانی کۆپی کردنی سیدی بۆ سیدی . دەتوانی بچیتە سەر فەرمانی (Copy Entire Disc) و لەسەر ئەم فەرمانە یەك جار کلیکی لای چەپ بکە .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Copy Entire Disc) شێوەیەکی ترمان بۆ دەرئەکەوێ ، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی (: Source Drive) جۆری پێناسەی سیدی ڕوومەکە دیاری بکە . بۆ نموونە ئەگەر سیدی ڕوومەکە (:E) بوو یان (:F) یان (:G) یان (:H) بوو ، ئەوە لە بۆشایی سەرەوە ئەو جۆرە دیاری بکە . ئنجا لە بۆشایی دووەمدا جۆری پێناسەی ڕایتەرەکە دیاری بکە بە هەمان شێوەی سیدی ڕوومەکە ، واتا ئەگەر (:F) یان (:G) یان (:H) یان (:I) بوو ، ئەوە ئەو بەشە دیاری بکە .



دوای دیاری کردنی سیدی ڕووم و ڕایتەرەکە لە هەردوو بۆشاییەکەی سەرەوە ، دەچیتە بەشی خوارەوەی ڕووبەری بەرنامەکە ، لەوێ چوارگۆشەیەکی بچووك ئەبینی ، ئەگەر ئەو چوارگۆشە بچووکە دیاری بکەیت ، ئەوە ڕاستەوخۆ لە سیدیەکەوە دەیگوازێتەوە بۆ سەر ڕایتەرەکە. ئەگەر ئەو چوارگۆشەیە دیاری نەکەیت ، ئەوە یەکەم جار سیدی نسخەکەت بۆ دەگوازێتەوە ناو هاردەکە و لە دواییدا بە ڕایتەرەکە کاری کۆپی ئەنجام ئەدات . دیاری کردنی ئەو چوارگۆشەیەش دەکەوێتە سەر خۆتان .



لە دوای دیاری کردنی چوارگۆشەکە ، لە بۆشایی (Writing Speed) خێرایی کۆپی کردنەکە دەسنیشان بکە . خێرایی کۆپی کردن تا کەم تر بێت باشترە ، واتا (١٦) یان (٢٤) بێت ، ئەوا بە شێوەیەکی ئاسایی کاری کۆپی کردن ئەنجام ئەدات ، ئنجا لە بۆشایی (Number Of Copies) چەند سیدیت پێویست ئەبێت ئەو ژمارەیە دیاری بکە.



دوای دیاری کردنی خێرایی کۆپی کردنەکە و ژمارەی سیدیەکانت ، کلیك بکە لەسەر (Burn) ، تا دەست بەکار بێت لە کرداری کۆپی کردنی سیدی بۆ سیدی ، چاوەڕوان بە تا کۆتایی کارەکە . واتا تا ئەو کاتەی ئەو دوو بۆشاییەی کە لە وێنەی ژێرەوە ئاماژەی بۆ کراوە ئەبێت بە ١٠٠٪ .



٥-دوایین بەش لە بەشەکانی بەرنامەی (Nero Express) ، کە بەشی پێنجەمە، ( Disc Image or Saved Project) ، تایبەتە بە گواستنەوەی ئەو فایلاتانەی کە پارێزراون دوای کۆپی کردن . واتا ئەگەر پێشتر فایلاتێکت بە هۆی ئەم بەرنامەیە کۆپی کردبوو و دوای کۆپی کردنەکە ئەو فایلاتانەت لە ناو هاردی کۆمپیوتەرەکە پاراستبوو ، ئەوە ئێستا دەتوانی بە هۆی ئەم بەشەوە جارێکی تر ئەو فایلاتانە کۆپی بکەیتەوە . واتا ئەگەر فایلاتەکانت لە هەر جێگایەك پاراستبوو ، ئەوە کاتێك کە لە سەر ئەم فەرمانە کلیك دەکەیت ، پەنجەرەیەکت بۆ دەرئەکەوێ . ئەو کاتە ئەو جێگایە هەڵئەبژێری ، کە فایلاتەکانت لێی پاراستووە ، ئنجا کلیك دەکەیت لەسەر فەرمانی (Open) ، لە دواییدا بۆ کۆپی کردنی سیدیەکە هەمان هەنگاوەکانی پێشوو بەکار دێنی .



# بەرنامەی Windows Washer

خوێنەری ئازیز ! ئەم بەرنامەیەش وەکو بەرنامەکانی تر سومەندە بۆ خاوێن کردنەوەی فایلە زیادەکانی ناو سیستەمەکە . واتا لە ڕێگای ئەم بەرنامەیەوە دەتوانی ڕۆژانە فایلە زیادەکانی ناو ئامێرەکەت بسڕیتەوە ، بە بێ ئەوەی هیچ زیانێك بە ئامێرەکەت بگەیەنیت .

پێم باشە هەر لە سەرەتاوە باسی چۆنێتی دانانی بەرنامەکە بکەم ، بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی ڕاست ئەم بەرنامەیە لەسەر ئامێرەکەتان دابنێن .



بەرنامەی (Windows Washer) لە ناو ئەو سیدیەدا هەیە ، کە لەگەڵ کتێبەکە دایە . بۆ دانانی ئەو بەرنامەیە لەسەر ڕووبەری شاشەکەوە بچۆرە سەر ئایکۆنەی (My Computer) ، لەوێشەوە بچۆرە سەر بەشی خوێندنەوەی سیدی و ئەو بەشە بکەوە ، ئەبینی لە ناو ئەو بەشە فۆڵدەرێکی تیایە بە ناوی (Windows Washer) ، ئەو فۆڵدەرە بە دوو جار کلیکی لای چەپ بکەوە .



دوای کردنەوەی فۆڵدەری (Windows Washer) دوو جار کلیکی لای چەپ بکە لەسەر ئەو فایلەی ، کە لە ناو فۆڵدەرەکەدا هەبوو . واتا فایلی (Washer) ، کە دوو جار کلیك ئەکەیت لەسەر ئەم فایلە شێوەیەکت بۆ دەر ئەکەوێ ، کە پێت ئەڵێ ئەتەوێ بەردەوام بێت لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer)؟ جا بۆ بەردەوام بوون ، کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Yes) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Yes) شێوەیەکی ترت بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا و لە ژێرەوە دوو فەرمان ئەبینی ، کە ئەتوانی بە هۆی فەرمانی یەکەم (Cancel) بەرنامەکە دانەنێیت . بە هۆی فەرمانی دووەمیش (I Agree) ئەتوانی بەردەوام بیت لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) . واتا بۆ بەردەوام بوون لە دانانی بەرنامەکە کلیك لەسەر فەرمانی (I Agree) بکە .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (I Agree) ، شێوەیەکی ترت بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا کۆمەڵێك چوارگۆشە ئەبینی ، کە ئەم چوارگۆشانەش هەڵبژاردنی شێوەی دانانەکەیە ، ئەتوانن هەر وەك خۆی جێی بهێڵن ، ئنجا لە ژێرەوە دوو فەرمان ئەبینی کە ئەتوانی بە هۆی فەرمانی یەکەم (Exit) لە دانانی بەرنامەکە بچیتە دەرەوە و، بە هۆی فەرمانی دووەمیش (Next) ئەتوانی بەردەوام بیت لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) ، واتا کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next) بۆ بەردەوام بوون لە دانانی بەرنامەکە .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی ترتان بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا کۆمەڵێك چوارگۆشە ئەبینی . ئەم چوارگۆشانەش هەمووی دیاریکراوە ، ئەتوانن هەر وەك خۆی جێی بهێڵن . ئنجا لە ژێرەوە سێ فەرمان ئەبینن ، کە ئەتوانن بە هۆی فەرمانی یەکەم (Back) هەنگاوێك بگەڕێنەوە بۆ دواوە . بە هۆی فەرمانی دووەمیش (Exit) ئەتوانن لە دانانی بەرنامەکە بچیتە دەرەوە . بە هۆی فەرمانی سێهەمیش (Install ) ئەتوانن بەردەوام بن لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) . کەواتە بۆ دانانی بەرنامەکە کلیك لەسەر فەرمانی (Install) بکە .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Install) شێوەیەکی ترت بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا کۆمەڵێك هێمای ڕاستە لە بەرامبەر نووسینەکان دەرئەکەوێت . تەنها چاوەڕوان بە تا کۆتایی ، ئنجا لە کۆتایی بچۆرە سەر فەرمانی (Next) ، کە بە هۆی ئەم فەرمانەوە ئەتوانی بەردەوام بیت لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) . واتا بۆ بەردەوام بوون لە دانانی بەرنامەکە کلیك لەسەر فەرمانی (Next) بکە.



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی تـرت بـۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا کۆمەڵێك هێمای ڕاستە لە ناو چوار گۆشەی بەرامبەر نووسینەکان دەرئەکەوێت ، تەنها چاوەڕوان بـە تـا کۆتـایی . ئنجا لە کۆتایی بچۆرە سەر فەرمانی (Next) ، کە بە هۆی ئەم فەرمانەوە ئەتوانی بەردەوام بیت لە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) . واتا بۆ بەردەوام بوون لە دانانی بەرنامەکە کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Next).



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Next) شێوەیەکی تـرت بـۆ دەر ئەکەوێ . لەو شێوە تازەیەدا کە دوا شێوەیە تەنها یەك فەرمان ئەبینی ، کە ئەویش فەرمانی (Finished)ە ، ئنجا بە هۆی ئەم فەرمانەوە ئەتوانی کۆتایی بێنی بە دانانی بەرنامەی (Windows Washer) ، واتا کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Finished) بۆ کۆتایی هێنان بە دانانی بەرنامەکە بە سەرکەوتوویی .



خوێنــەری ئــازیز ! دوای دانــانی بەرنامەکــە بەســەرکەوتوویی ، ڕاستەوخۆ شێوەی بەرنامەکەت لەسەر ڕووبەری شاشەکە بۆ دەرئەکەوێ. لـەو شـێوەیەدا تەنـها ئـەوە ئـەمێنی ، کـە دەسـت بکرێـت بـە خـاوێن کردنەوەی ئامێرەکە . واتا بۆ پاك کردنـەوەی سیستـەمی کۆمپیوتەرەکە لە فایلە زیادەکان ، ئـەتوانن بچنـە سـەر فەرمانی (Wash Now) و یـەك جار کلیکی لای چەپ بکەن لەسەر ئەو فەرمانە .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Wash Now) شێوەیەکی ترت بۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوە تازەیەدا کۆمەڵێك فـەرمان و شـێوە ئـەبینی . ئەتوانن بۆ پاك کردنەوەی ئامێرەکە لە فایلە زیادەکان کلیك بکەن لەسەر فەرمانی (Start) ، کە ئەکەوێتە ژێرەوەی شێوەکە ، بـۆ دەسـت بـەکار بوون لە خاوێن کردنەوەی ئامێرەکە لە فایلە زیادەکان ، ئەبێت چاوەڕوان بیت ، تا هێمای ڕاستە لە بەرامبەر هەموو شێوەکان دروست ئـەبێت ، ئنجا لە کۆتاییدا کلیك بکە لەسەر فەرمانی (Finished) .



دوای کلیك کردن لەسەر فەرمانی (Finished) شێوەیەکی تـرت بـۆ دەر ئەکەوێ ، لەو شێوەیەدا کۆمەڵێك بۆشایی و ژمارە ئەبینی ، کە ئەو ژمارانەش کۆی ئەو فایلانەت بۆ سەر ژمێر ئەکات ، کە ئەم بەرنامەیە هەستاوە بە پـاك کردنـەوەی . لـە کۆتـاییدا تەنـها ئـەوە ئـەمێنێ کلیـك بکرێت لەسەر فەرمانی (Clear Statistics) بۆ کۆتـایی هێنـانی کـرداری پـاك کردنەوەکـە . ئنجـا لەسـەرەوەی شـێوەکەدا کلیـك بکرێـت لەسـەر فەرمانی (Close) بۆ داخستنی شێوەکە .



# FORMAT & SETUP WINDOWS

## ئەم کتێبە

ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتووە :

١- فۆرمات .

٢- دانانی ویندۆز .

٣- فۆنتی کوردی .

٤- پێناسەی دەنگ .

٥- پێناسەی شاشە .

٦- پێناسەی مۆدێم .

٧- بەرنامەی نیرۆ .

٨- بەرنامەی ویندۆز واشەر .

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە ٤٦٦ ساڵی ٢٠٠٤ ی دراوەتێ